# مەسەلەکانی ئافرەت لە نێوان مەعریفە و ئایدۆلۆژیا
# لە کۆمەلگای ئیسلامیدا

فاتمە عومەر ڕێشاوی
Fatima1964_1@hotmail.com
8- 2005

خوێنەری بەڕێز

ئەم ناميلەكەيە

پێشتر لە شێوەی ووتارێكدا لە چەند ماڵپەڕ و گۆڤارێكدا لە 9- 2005 دا بلاوكراوەتەوە

((بە ناوی بە ئايدۆلۆژيابوونی مەسەلەكانی ئافرەت ))

وا ئێستە لێرەدا لە شێوەی ناميلكەيەكدا بەناوی

((مەسەلەكانی ئافرەت لە نێوان مەعريفە و ئايدۆلۆژيادا))

بە چەند دەستكاری و چاكسازيەكەوە جارێكی تر بلاودەكەمەوە

فاتمە عومەر ڕێشاوی

هۆلەندا 9- 2006

ناوەڕۆک

---

وەک هەموو دەزانین کێشەی ئافرەت و پێشێکردنی مافەکانی لە لایەن پیاوەوە تایبەت نیە بە زەمانێکەوە یان کۆمەلگەیەکەوە، ئەی بۆچی ئەم کێشەیە لە ناو کۆمەلگە ئیسلامیەکاندا ئەوەندە دیار و زەقە و زۆربەی تاوانەکانیش لەم کایەیەدا دەدرێنە پال ئیسلام ؟

دیارە کێشەکانی ئافرەت هەمووی نابەسرێنەوە بە ئیسلامەوە، بەلام ئیسلام لە چنین و هۆنینەوەی ئەو کەلتوورەدا ڕۆلێکی گرنگی دیوە. جگە لەوەش ئەو هۆکارانەی (وسائل) کە ئیسلام لە سەردەمی هاتنیدا گرتنیە بەر بۆ گۆڕانکاری لە ژیانی ئافرەتاندا، دوای چەندین سەدە هەر وەکو خۆیان مانەوە و بەلکو بوونە ئامانجیش. لە درێژەی ئەم باسەدا چۆنیەتی ئەم بۆچوونە ڕووندەکەینەوە

**پێشەکی**

هەتا ئەمڕۆش ئێمەی ئافرەت لە داواکردنی مافەکانمان و بەشدار بوون لە گۆڕانکاریەکان بەرە و کۆمەلگایەکی مەدەنی وا فێرکراوین لە مەیدانی ڕاڤە کردن و تێگەیشتن و لێکدانەوە و خوێندنەوەی ئەو کەلتوورەی کە بەشێکی زۆری تێکستە پیرۆزەکان پێکیانهێناوە و لە ناوەندی کۆمەلگەیەکی باوکسالاریەوە هەلقولاوون و بونەتە گرفت لای زۆرمان،.. هەر بە تەمای پیاو بین و جێ دەستێکمان دیار نیە و نەمان وێراوە بەهزر و بینینی خۆمان بۆ تەنها جارێکیش لەو شەپۆلانەدا سەول لێدەین .. ئەمە یەکێکە لە هۆیەکانی زۆر خایاندن و زۆر تێچوونی پرۆسەی گۆڕانکاری.

کاتێ شکستی ڕووی کردە ژیاری ئیسلامی و قەیران و گرفتە کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسیەکان لەسەر یەک کەلەکە بوون، هەمیشە کۆمەلێک لەو گرفتانە کاریگەری نێگەتیڤی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان لەسەر ئافرەت هەبووە هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە هەر کۆمەلگایەکدا هاوسەنگی دەسەلات هەر بە تەواوی ڕاست نەبووبێتەوە و یاسا دانان و بڕیاردان هەر لە دەست ڕەگەزێکدا بێ (کە ئەویش پیاوە) بویسترێ یان نەویسترێ لە کاتی شکستی و ئەزمە و گرفتەکاندا حەیف و زولم دەکەوێتە سەر ڕەگەزەکەی تر (کە ئافرەتە)..
بە شێوەیەکی گشتی ئەو کەسانە کەم بوون کە دان بەو گرفت و قەیرانانەدا نەنێن بەلام کێشەکە لەوەدا بوو :
هەندێ پێیان وا بوو، هۆکاری ئەم شکستیە ئەو کەلتور و سیستەمە ئیسلامیە یە کە پەیڕەو دەکرێ بۆیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە ڕوویان بە تەواوی کردە خۆرئاوای پێشکەوتوو و حەساوە و هۆشیارییەکی کال و کرچ لاسایی کردنەوەیەکی بێ ئاگایانە لە مەسەلە گرنگەکانی ئافرەتاندا پەیدا بوو.
هەندێکی تر پێیان وا بوو، هۆکاری ئەم شکستیە، پەیڕەوکردنی هەلە و دوور لە ڕاستی سەرچاوەکانی ئیسلامە بۆیە بە لای ئەوانەوە گەڕانەوە بۆ ئەو ناسنامەیە و پاپەند بوونی تەواو بەو یاسا و ڕێسایانەی کە لە قورئان و سوونەت دا هەیە، تەنها ڕێگەیە بۆ چارەسەرکردنی هەموو گرفتەکان. بەلام گەڕانەوەی ئەمانیش بۆ لای ئیسلام زیاتر گەڕانەوەیەکی ڕوالەتی و تقوسیانە بوو، لەوەی گەڕانەوە بێ بۆ جەوهەر و مانا و بەها مرۆڤایەتیەکانی سەرەتای هاتنی ئیسلام.
سالانە چەندها کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوە لەسەرانسەری جیهاندا دەگیرێ بۆ چاک کردنی باری کۆمەلایەتی ئافرەت بە گشتی و باسکردنی مافە پێشێل کراوەکانی، کە هەندێ جار ئافرەتان لەدروستکردنی ئەو بارە نالەبارانەدا خۆشیان بەشدارن. فاکتەری ڕزگاریشیان لە دەست ئەو بارە لە هۆشیاربوونەوەی خۆیاندایە. دیارە ئەم ماف پێشێلکردنە بەرامبەر ئافرەت تایبەت نیە بە کۆمەلگە و زەمەنێکی دیاری کراوەوە بەلکو لە هەموو کۆمەلگەو زەمەنێکدا بە ڕادە و شێواز و بیانوو و بەلگەی جیاواز ئەو کێشەیەی بەخۆوە دیوە، خۆ ئەگەر بێتوو باس لەم زەمەنەی خۆمان بکەین ئەوە کۆمەلگەی ڕۆژهەلاتی بە گشتی و ئیسلامی بەتایبەتی جارێ لە ژێر ئەو بارەدا هەر دەنالێنێ.

پڕیشکی نێگەتیڤی ئەو بارە کۆمەلایەتیە ناهەموارەی کە ئافرەتی موسلمانی تێدا ئەژی گەشتۆتە دەرەوەی جیهانی ئیسلامیش و بوونەتە باس و خواسی هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەی پەرلەمان و دەزگا کۆمەلایەتی و سیاسی و میدیاکان و چەندەها پرسیار و گرفتی بێ وەلام و بێ چارەی لای ڕۆژئاواییەکانیش دروست کردووە، تەنانەت هەندێک پێیان وایە کە ئەم کێشانە زیان بە کۆمەلگەی مەدەنی ڕۆژئاواش دەگەیەنێ لەوانە: کوشتن لەسەر شەرەف و بە زۆر بە شوودان و

خەتەنەی کچان و لێدان و توند و تیژی بەرامبەر ئافرەت. _ لێرەدا مەبەست لەوە نیە کە لە کۆمەلگای خۆرئاوادا لێدان و توندوتیژی بەرامبەر ئافرەت نەماوە، نەخێر بەلکو مەبەست لەوەیە ئەوان چەندەها دەزگای کۆمەلایەتی و سزای یاساییان هەیە لە دژی ئەو دیاردانە- .

لێرەدا ڕوونکردنەوەیەک پێوستە کە ئەویش ئەوەیە، من لەم باسەدا ڕووی بەرپرسیاری و ڕەخنەم نە لە ئیسلام خۆی و نە لە لایەنێکی ئیسلامی سیاسی تایبەت نیە .. بەلکو ڕوو دەکەمە سەرتاپای ئەو سیستەم و کەلتورەی کەبەدرێژایی مێژوو لە ئەنجامی کەلەکە بوون و تێکهەلکێشانی کۆمەلێک بارودۆخی ئالۆز، دروست بووە. ئەو کەلتوورەی هەموو گروپ و حزب و دەسەلات و ڕێکخراو و دەزگا ئایینی و نائایینیەکان و میانەڕەو و توندڕەو چەپڕەو و ڕاستڕەو پێکیانهێناوە، و لە هەمان کاتتدا ئاڕاستەشیان دەکات و ئاوێتەی یەکتر بوون. تا لە پیاداچوونەوەیەکدا بتوانین خۆمان بەرەو ڕووی خۆمان ببینەوە پێش ئەوەی دەرەوەی خۆمان بەرەو ڕوومان بکاتەوە و ئەجندەی خۆیان (بە ئەنقەست یان بێ ئەنقەست) بەسەرماندا بسەپێنن.

وەک هەموو دەزانین بەشێکی زۆربەی یاسا و ڕێساکانی ئەحوالی شەخسی دەولەتە ئیسلامیەکان لە قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەیان گرتوە و بوونەتە کەلتوور و تا ئێستەش بەرگریان لێدەکرێ ، کەچی لە لایەکی تریشەوە ڕێژەیەکی باش لە کۆمەلگەی ئێمە بە تایبەتی و کۆمەلگە ئیسلامیەکانی تر پێیان وایە زۆربەی ئەو و یاسا و ڕێسایانە لەگەل دنیای تازەی ئەمڕۆدا هەل ناکەن .. بۆ ئەمەش بەلگەی تیۆری لە ناو تێکستی پەڕاوەکاندا و پراکتیکی لە ژیانی واقعدا دێننەوە... لەم باسەدا زیاتر لەو بەلگە تیوریانە دەکۆلینەوە ..

من لەم باسەدا دەمەوێ ڕۆلی ناوبژیوانێک ببینم لە نێوان لایەنەکانی ئەو ململانێ و مجادەلەیەی کە ئەمڕۆ لە مەیدانی گۆڕانکاریەکاندا بوونی هەیە بۆ ئەمەش کۆمەلێک پیاداچونەوە و پرسیار سەبارەت بە تێکستەکانی قورئان خۆی دێنمە مەیدانەوە. بە ڕای من بۆ ئەوەی هەردوو لایەنی ململانێکە لەیەکتر بگەن پێویستیان بەو پیاچوونەوەیە هەیە و دەبێ ڕەچاوی چەند بنەمایەک هەیە بیکەن:

یەکەمیان: خوێندنەوەیەکی بابەتیانە، بۆ ئەوەی بتوانین لەو تێکستانە بگەین و هەقی خۆیانی بدەینێ، پێویستە هەر یەکێ لە لایەنەکانی ئەم ململانێیە لەو بۆچوونە پێشگیریەی ( **القناعات المسبقه** ) کە هەیەتی خۆی ڕزگار بکات، ئەو بۆچوونە پێشگیریەی کە- بە ناو علمانیەک - هەیەتی ئەوەیە کە قورئان یان ئیسلام هەمیشە بە چاوێکی سوک سەیری ئافرەت دەکات و زولمی لێدەکات.... ئیتر بەم بیرو بۆچوونەوە دەگەڕێ بە دوای ئەو بەلگانەی کە ئەو بۆچوونەی ئەو

دەسەلمێنێ... ئەو بۆچوونە پێشگیریەی کە ئیسلامیەکیش هەیەتی ئەوەیە کە قورئان یان ئیسلام بۆ هەموو گرفتێک چارەی بنەڕەتی داناوە و هیچ کەس بۆی نیە بە چاوی ڕەخنەوە سەیری بکات. بەم بۆچوونەوە بە دوای ئەو بەلگە و ڕاستیانەدا دەگەڕێ کە جوانی سیستەمی ئیسلام بسەلمێنێ....

دووەمیان :خوێندنەوە و لێکدانەوەی تێکست لە کۆنتێکسدا .. بە مانایەکی تر مرۆڤ بۆ ئەوەی ڕەخنەیەکی زانستیانە لە واقعێک یان یاسایەک بگرێ یان بیەوێ بابەتیانە بەرگری لێبکات .. دەبێ ئاگادار بێ لە نهێنیەکانی پێکهاتەی ئەو زەمان و کۆمەلگایە و ئەو هۆکارانەی ئەو بابەتەی تێدا هاتۆتە کایەوە. بە مانایەکی تر پێویستە باری کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و زانستی ئەو زەمەن و کۆمەلگەیەی کە تێکستێکی تێدا دەخولقێ و ئەو زەمەن و کۆمەلگەیەی ئەو تێکستەی پێدەگات، ڕەچاو بکرێ.

سێهەمیان: لێکدانەوەی تێکستەکانی قورئان بە شێوەیەکی حەرفی نەبێت .. خوێندنەوە و تێگەیشتنی حەرفی مانای نابێ ئەگەر نەزانین ئەو پەیامەی تێکستێک لەگەل خۆی هەلیگرتووە چیە و لە کوێدایە ؟؟

چوارەمیان: تێکەل نەکردنی ئامانج و ئامڕاز .. بە مانایەکی تر لەپشت هەموو کتێب و تێکستێکەوە پەیامێک هەیە، بۆ گەیشتن بەو پەیامە لە زەمەن و هەل و مەرجێکی تایبەتیدا ئامڕازێک بەکاردەهێنرێ.. دەشێ لە کۆمەلگەیەکی تر و هەل و مەرجێکی تردا هەمان ئامڕاز، -با بە ناوی لە خواشەوەبێ- دەستنەدات .

کاتێ مرۆڤ هەموو توانایەکی دەخاتە کار بۆ وەدی هێنانی ئامانجێک کە لە بنەڕەتتدا ئامڕازە ئەوە گەورەترین زیان بە ئامانجەکە و بەئامڕازەکەش دەگەیەنێ.

بە بۆچونی من بۆ ئەوەی قورئان لە ناو مێژوودا بمێنێتەوە و هەقی خۆی بدرێتێ و شان بەشانی سەرچاوە مەعریفیەکانی تر ڕۆلی خۆی ببینێ، ناکرێ لەیەک گۆشە نیگایەوە لێی بڕوانرێ، دیارە بۆ ئەوەی ئەمەش لە توانادا بێ دەبێ قورئان بکرێت بە چەند بەشێکەوە و بۆ هەر بەشێک لە گۆشە نیگایەکی تایبەت بەخۆیە خوێندنەوەی بۆ بکرێ. دەکرێ هەندێ لەو بەشانەش لەم خالانەدا کۆبکرێنەوە:

1- بەشی مۆرال و ڕەفتار: لە پەروەردەکردنی تاک و کۆمەل لەسەر ڕەوشتی بەرز وەک ڕاست گۆیی ودەست پاکی و لێ بووردەیی و بەزەیی و پاک ڕاگرتن و خاوێنکردنەوەی دل و دەروون ......

دیارە ئەوەش بنەمایەکی بەهێزی هەموو دین و فەلسەفە و بیرە کۆمەلایەتیەکانن. چەسپاندنی مورال و فەزیلە ئامانجی هەموو کەلتوور و دین و بیر و بۆچوونەکانی مرۆڤایەتیە و هەولی بۆ دەدات ، بەلام هەریەکەیان ئامڕازی جیاواز بۆ ئەو پەیامە دەگرنە بەر.

2- بەشی مێژوو: چیرۆک و بەسەرهاتی پەیامبەران و گەلانی پێش هاتنی ئیسلام.
3- وێناندنی دیاردە گەردونیەکان: ئەم بەشە پەیوەندی بە زانستی گەردوونیەوە هەیە

4- وێناندنی دیاردە کۆمەلایەتیەکان: کە بەشێکە لە زانستە مرۆییەکانە وەک ( **ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیر ما بانفسهم**) **واتە** (بێگومان خوا بار ودۆخی هیچ قەوم و گەلێک ناگۆڕێت تاکو ئەوەی لە دەروونیاندا هەیە نەیگۆڕن )
5- بەشی خواناسین وپەرستن: پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خواوەند دیاری دەکات
6- بەشی مامەلە: پەیوەندی مامەلەکردنی مرۆڤەکان لەگەل یەکتردا سەبارەت بە کار و باری ڕۆژانە لە کڕین و فرۆشتن و قەرز و میرات و هتد ..دیاری دەکات. ئەم بەشە پەیوەستە بە خواناسیەوە
7- جیهاد و ئەحکامەکانی تری جەنگ و کوشتار. تێکستەکانی ئەم بەشە زۆر جار لە لایەن دەسەلاتداران و گروپەوەکانەوە بۆمەرامی سیاسی خۆیان بەکاریدێنن.... بۆیە کارەساتێکی وەک ئەنفال، ووشەی انفال ی بۆ بەکاردەهێنرێ ..!!

9- بەشی یاسا کۆمەلایەتیەکان و ئەحوالی شەخسی: ئەو کۆمەلە تێکستانەن کە پەیوەندیان بە ڕیکخستنی کۆمەلگەی ئیسلامیەوە هەیە. هەر وەها ئەو تێکستانە ی ( الایات) کە زیاتر ئەرک و مافەکانی ئافرەتان و پەیوەندیان بە کۆمەلگەوە دیاری دەکات.

ئەم بەشەیان واتە ( یاسا کۆمەلایەتی و ئەحوالی شخسی ) دەبێتە تەوەری ئەم بابەتە. ئەم بەشە ( بە تایبەتی مەسەلەکانی ئافرەت) زیاتر لە هەموو بەشەکانی تر بوەتە مەیدانی مشت و مڕ و ململانێ و ڕەخنەی زۆرکات نا زانستی و لە بەرامبەریشیدا بەرگری لێکردنێکی لاواز.

ئەو تێکستانە، زۆر جار لەلایەن یاسادانەران و پیاوانەوە بە خراپی بەکارهێنراون لە بەرامبەر ئەمەدا بزوتنەوە و داکۆکیکارانی مافەکانی ئافرەتان جامی ڕەخنە و توڕەیی خۆیان بەسەر ئەم تێکستانە قلپ دەکەنەوە. لە کۆتایی ئەم بابەتەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە هۆکاری ئەم دوو هەلوێستە نادروستە، دەگەڕێتەوە بۆ یەک جۆر تێڕوانین، ئەویش ڕەچاونەکردنی هەلومەرجی کۆمەلایەتی و ڕادەی ڕۆشنبیری ئەو کۆمەلگە و مرۆڤگەلەی کە ئەم تێکستانەی تێدا هاتۆتەدی و یاساکانی لێوەرگیراوە. هەروەها نەبوونی خوێندنەوەیەک بۆ تێکستەکان لە کۆنتێکستی خۆیاندا.

لێرەوە ئەو تێکستانە ( الایات) بە پێی ئەولەویەت و کاریگەرییان لە دروستکردنی هەندێ لە کێشە کۆمەلایەتیەکان لەم سەردەمەدا لە کۆمەلگە ئیسلامیەکاندا بەم شێوەیە ڕیز دەکەم :

## * فره ژنی  النساء 3

**و ان خفتم الا تقسطوا في اليتامى فانكحوا ما طاب لكم من النساء مثنى و ثلاث و رباع فان خفتم الا تعدلوا فواحدة او ما ملكت ايمانكم ذلك ادنى الا تعولوا***

(( ئەگەر ترسی ئەوەتان هەیە کە لە بابەت  کچانی هەتیو نەتوانن دادگەری بکەن (لە مارەکردنی ئەوانە وازبێنن ) جا ئافرەتانی تر کە خۆشتان لێیان دێ و  پێتان خوشیک و پاکن، دوان یان سیان یان چوار مارەیان بۆ خۆتان ببڕن ، جا ئەگەر بترسن کە نەتوانن دادگەری لە بەرچاو بگرن ، یەک ژن بەسە یان لە ژنانێ کە خاوەنی ئەوانن کەلک وەربگرن، ئەمە نێزیکترە بۆ خۆ لادان لە ستەم و  بێ دادگەری کردن) **1***

ئەوەی کە لە زەمینی واقعدا پراکتیزێرە دەکرێ ئەمەیە(( چەند لە ژنان پێتان خۆشبن دوان یان سێ یان چوار مارە بکەن بە مەرجێ دادپەروەرانە لەگەلیان بجولێنەوە ))دیارە کاتی ئەم تێکستە بەم شێوە نیوەناچلی و حەرفیە  هەلسو کەوتی پێ بکرێ و تێرمی ((دادپەروەری)) وا لێک بدرێتەوە کە ئەو پیاوە هەموو ژنەکان لە ڕووی ماددیەوە وەک یەک سەرپەرشتی بکات... ئەوا  زۆر  ئاسانە بۆ هەرکەس بیەوێ شەرعیەت بۆ خۆی وەرگرێ و هەموو شتێک بکاتە بیانوو و مەسلەحەتی مەشروع و مەلا و قازی و مەحکەمە ڕازی بکات  کە  ئەو لە ڕووی ماددیەوە توانای  بەخێو کردنی زیاتر لە ژنێک و منالەکانی هەیە و  بە باشترین شێوە دەتوانێ هەلس و کەوتیان لەگەل بکات .

مەلا و قازی و مەحکەمە خۆ نابن بە پاسەوان بە سەریەوە بۆ ئەوەی کە ووتوێتی جێبەجێی ئەکا یان نا !!

بەلام ئەگەر بێتوو تێکستەکە جارێکی تر لە دوو ڕوانگەوە بخەینە بەر لێکۆلینەوە، ئەوا بە شێوەیەکی تر تێی دەگەین و مامەلەی لەگەلدا دەکەین. ئەو دو ڕوانگەیەش لەم دووخالەدا دەخەمە ڕوو:

 یەکەمیان کۆنتێکستەکەی  واتە هۆ و بار ودۆخی هاتنەدی ئەو تێکستە. دووەمیان لێکدانەوەی ڕێزمانی و زمانەوانی.

* هۆی یان ( علەی ) ئەم تێکستە  لە تەفسیری ( **الطبري ، القرطبي و ابن الكثير** )دا 2 *بەم شێوە هاتووە: (( لەو کاتەدا لە کۆمەلگەی نیوەدوورگەی عەرەبیدا نەریتێک هەبوو ئەوەیش ئەوە بوو کە پیاوان پێنج یان شەش یان حەوت ژنیان هەبوو، دوای ئەوەش ئەیوت: بۆ منیش وەکو فلان کەس ژنێکی تر نەهێنم. یان لەبەر ئەوەی ژن و منالیان زۆر بوو، باری گوزەرانیان قورس دەبوو،  بۆئەمە تەماعیان دەکردە مالی یەکێک لەو مندالە  بێ باوکانەی کە لە ژێر سەرپەرشتیاندا بوون، تا ژنی پێ بێنن، یان گوزەرانیان باشتر بکەن. بۆیە فەرمانیان پێدرا کە لە چوار ژن زیاتر ناهێنن، ئەوەش بۆ پاراستنی مالی ئەو منالە بێ باوکانە.

هۆكارێكی تر ئەوە بوە كە پیاوان تەماعیان لە كچانی بێ باوك دەكرد، نەشیان دەتوانی مارەییان بدەن و ئەگەر ماڵێكیشیان بوایە لێیان داگیر دەكردن. دوایش لەگەڵیاندا باش نەدەگوزەران و ژیانیان لێ تاڵ دەكردن. بۆیە ڕێیان لێگیرا ئەو كچانە مارە بكەن، لە بری ئەوە ئەو فرەژنیەی كە هەبوو هەر مایەوە بەلام بە – چوار– سنوری بۆ دانرا و مەرجەكەشی ئەوە بوو كە ژنانی تر مارە بكەن كە بێ سەرپەرشتیكار ماونەتەوە و لەو كاتەشدا زۆر بون).

ئەگەرلە ڕووی ڕێزمانەوە لە تێكستەكە وورد بینەوە دەبینین ئەم حوكمە بە دوو سێ مەرجی گرانەوە گرێدراوە:

یەكەمیان: و ان خفتم الا تقسطوا في اليتامى فانكحوا ما طاب لكم من النساء **مثنى و ثلاث و رباع** ئەگەر ترسی ئەوەتان هەیە سەبارەت بە بێ باوكان نەتوانن دادگەری بكەن ــ بەوەی كە تەماع لە ماڵیان دەكەن بۆ هێنانی ژمارەیەكی زۆر لە ژنان، یان تەماع دەكەنە كچانی بێ باوك بێ ئەوەی مارەییان بدەن وماڵیشیان لێ زەوت دەكەن– جا ئافرەتانی كامل مارە بكەن بەلام تا چوار.

ئەو (فاء ) ە كە پێی دەوترێ (( **فاء السببية تربط بين الشرط و جواب الشرط** )) دوو ڕستە بەیەكەوە دەبەستێ یەكێكیان پێی دەوترێ (**جملةالشرط**) مەرجێكی تێدایە، ئەویتریان پێی دەوترێ وەلامی مەرجەكە (**جواب الشرط**).

**(ان خفتم الا تقسطوا في اليتامى)** حرفی( **ف** ) ئەیبەستێ بە ( **انكحوا ما طاب لكم من النساء مثنى و ثلاث و رباع** ...). بە نەبوونی مەرجەكە، وەلامی مەرجەكەش هەلدەوەشێتەوە.

دووەمیان : **فان خفتم الا تعدلوا فواحده** .... *وە ئەگەر لەوەش ترسان كە نەتوانن دادپەروەر بن لەگەلیاندا.... **تەنها یەک ژن بێنن**...... ئەم ڕستەیەش لە ڕووی ڕێزمانەوە هەمان ڕێسای سەرەوە دەیگرێتەوە، – **ان خفتم الا تعدلوا – ف – واحده**.
بە نەبوونی مەرجی دادپەروەری، حوكمی فرە ژنی هەلدەوەشێتەوە ..
چونكە لە نێوان هەردوو ڕستەی ــ **ان خفتم**– پیتی **ف العاطفة** هەیە.

**ان خفتم الا تقسطوا في اليتامى فانكحوا ما طاب لكم من النساء مثنى و ثلاث و رباع فان خفتم الا تعدلوا فواحدة الا ما ملكت ايمانكم ذلك ادنى الا تعولوا.**

لێرەدا كەسێك دەتوانێ بلێ: ئەوە نیە دوای **فواحدة – الا ما ملكت ايمانكم**– یان لە ژنانێ كە خاوەنی ئەوانن كەلك وەربگرن هاتوە–.... لە وەلامدا دەلێم بەلام –ما ملكت ايمانكم – نەریتێكی كۆمەلایەتی تایبەت بوە بەو ڕۆژگار و سەردەمە. ئەمڕۆ ئەو نەریتەش بەسەر چوە.

سێهەمیان : **ذلك ادنى الا تعولوا** ((ئەمە نێزیكترە بۆ خۆ لادان لە ستەم و بێ دادگەری كردن))، ئەگەر پێچەوانەی ئەو مانایە وەرگرین دەگەینە ئەوەی كە ((فرە ژنی نزیكە لەستەمكردنەوە )) . ئێمە هەرگیز لەم پەیامە نەگەشتووین و نەترساوین..

جگە لەوەش نابێ ئەوەشمان لەبیرچێ ووشەی داد کە سێ جار دووبارەکراوەتەوە **الا تقسطوا** ، **الا تعدلوا** ، **الا تعولوا** .. مانای جیاواز و فراوانی هەیە ، تەنها دادوەری نێوان ژنەکان ناگەیەنێ. چونکە دەبوو دەستەواژەکە بەم شێوە بوایە **((الا تعدلوا بينهن فواحدة))** . لە بری ((**الا تعدلوا فواحده**)) بەلکو دادوەری بە مانای گشتی ناو کۆمەلگەش دێ ...؟؟ ئایا ئەو ڕۆژگار و کۆمەلگە پیان سروشتی و ڕەوایە ... ئایا ئەو فرە ژنیە خۆی لە خۆیدا نابێتە هۆی دروست بوونی کەشێکی نادادوەرانە لە ناو خێزان و کۆمەلگە .. ئایا زیانی زیاترە یان قازانجی . چونکە (( هەموو شتێک لەم دنیایە لایەنی پۆزەتیڤی هەیە تەنانەت شەیتانیش .))

جگە لەوەش ئەگەر بارو دۆخی کۆمەلایەتی ئەو کاتە بێنینە بەرچاو پرسیارێک دێتە کایەوە ئایا ئەو کاتە پیاوان مافی یەک ژنیان هەبوە و ئەم تێکستە مافی زیاتری پێداوون یان ئەم پێی کەم کردوونەتەوە؟؟ ...لە کۆمەلگەیەکدا ژن هێنان بێ سنوور بووبێ یان هەروەک شت ومەک تەملیک کرا بێ ...کاتێ کە ئیسلام دێت دیارە ناتوانێ بە یەکجار لە و بێ سنووریەوە بیگەیەنێتە سنووری ((یەک ژن ))چونکە هەموو هەل ومەرجە ئابووری و کۆمەلایەتیەکان لە ئارادا نەبوون و باری عەقلی و دەروونی هەردوو ڕەگەزەکە بە شێوەیەکی تەواو ئامادە نەبوە بۆ گۆڕانکاریەکی وا بنەڕەتی..
کەواتە: ( فرەژنی بە ژمارەیەکی دیاریکراو) لەم تێکستەدا ئامڕازێکە بۆ ئامانجێک ئەویش:
1-پاراستنی سەروەت و سامانی منالانی بێ باوک،
2-ڕزگارکردنی توێژێک لە ئافرەتان کە کچانن لە دەست حەز و تەماعی پیاو.
3- دروستکردنی هەل بۆ ئەو ژنانەی کە لە تەمەندا کامل بوون و بێ هاوسەر و سەرپەرشتیکار بوون .
4- هەروەها سنووردار کردن و مەرجدارکرنی دەسەلاتی پیاو لەو مافەی کە کەلتورێکی باوکسالاری پێیدابوو تا لە هەر کاتێکێدا هەر هەل و مەرجێکی لەبار تر هاتە پێشەوە بتوانرێ سنوردار تر و کەمتر بکرێتەوە.
بەلام ناهۆشیارییەکە لێرەدا چیە؟؟ ئەوەیە ... ئەم حوکمە کە ئامڕازێک بوو بۆ گۆڕانکاریەکی تەواو لە پێناوی بەرژەوەندی پیاودا کرایە ئامانج و ماف. ئەو پەیامەش بەردەوام نەبوو تا لەو چوارەیشەوە بهێنرێتە سەر ((یەک ژن )).
ئەوەی کەدەبوو ڕووی بدایە، ئەوە بوو دەبوایە فتوادەران و یاسادانەران لە ئاستی ئەم ووشە و مەرجە قورسانەدا هەلوێستیان هەبوایە و نەیانوێرایە دەستی پیاو بەم شێوەیە بەناوی خواوە بەرەلا بکەن بۆ یاریکردن بەهەست و نەستی ئافرەت نەک ئەو تێکستە بە ڕاست و چەپدا بە هۆی فتوا و یاساکانی ئەوانەوە بۆ بەرژەوەندی پیاوان و کەلتوری باوکسالاری و پیاو سالاریدا بەکار بهێنرێ ... بێ

گوێدان بەو ڕاستیەی کە بۆچی قورئان بەو شێوە قورس و مەرجدار و ناچاریە ئەو چارەسەرە دادەنێ؟ یان پەیوەندی ئەم حوکمە چیە بە کچانی بێ باوکەوە؟؟

ئەمە و لەلایەکی ترەوە، هەر لە هەمان سورەتدا تێکستێکی تر هەیە ((و لن تستطیعوا ان تعدلوا بین النساء و لو حرصتم فلا تمیلوا کل المیل فتذروها کالمعلقة و ان تصلحوا و تتقوا فان الله کان غفورا رحیما)). النساء 129. واتە

(( وە هیچ کاتێ ناتوانن لە نێوان ژناندا دادگەری بە ڕێوە بەرن، هەرچەن بتانەوێ بیکەن، جا بە تەواوی لە دادگەری خوار مەبنەوە تا ژنەکە وەک کەسێ کە بەسترا بێتەوە( سەرگەردان) ڕاگرن، وە ئەگەر کردەوەی خۆتان چاک کرد و لە (خواری) پارێزتان کرد، بە ڕاستی خوا غەفور و ڕەحیمە )). پەیامی ئەم تێکستە هۆشیارکردنەوەی موسولمانە لە بەرپرسیارێتی فرەژنی و ئەو ڕاستیەی کە پیاوان هەرگیز ناتوانن دادوەری لە نێوان چەند ژنێکدا پەیرەو بکەن-با بشیانەوێ- لەبەر ئەوە فەرمانیان پێدەدات کە کارێک نەکەن کە یەکێک لەو ژنانە وەک هەلپەسێرراوی لێبێ. واتە -نە هاوسەری هەیە و نە ئازادیشە- بۆیە خۆتان چاک کەن و لە خوا بترسن.

بەلام ئەوەی لە واقعدا دەبینین ئەوەیە کە هێندەی ئەو تێکستەی کە ڕێگەی داوە بە فرەژنی کاری لەسەر پیاوان هەبوە، هەرگیز ئەم تێکستە کەواقعی نێگەتیڤی فرەژنی زۆر بە جوانی دەدەرکێنێ و ئەو مەرجانەش کە لە فرەژنیدا دانراون، کاری لە یاسادانەران و پیاوان و کۆمەلگەش نەکردوە.

لایەنگرانی فرەژنی لەبەر ئەوەی پێیان وایە هەمیشە ژن پێویستی بە چاو دێری و سەرپەرشتی پیاو هەیە _ پێشیان خۆشە هەر وابمێنێتەوە - !! وە دەشبێ ژن هەمیش لە ئاستی ئارەزوو و پێداویستیەکانی پیاودا بێ، دەگەڕێن بە دوای بیانوو هێنانەوەدا بۆ فرەژنی، وەک :

* لە کاتێکدا ژنەکە منالی نابێ، یان کوڕی نابێ .
* لەکاتێکدا ژنەکە ناتەواویەکی هەبوو لە مالداریدا

لەبەر ئەوەی هۆکاری هاتنە دی ئەم تێکستە هیچ پەیوەندی بە و بیانوانەوە نیە، وا چاکترە واز لەم بیانوو و بەلگانە بهێنرێ چونکە ئەوە ئەوپەڕی جیاوازی ڕەگەزایەتییە و (**تمییزعنصري**) لە مەودوا کەس پێی ڕازی نابێ ..

چونکە ئەی ئەگەر ئەو منال نەبوونە لە پیاوەکەوە بێت ؟ ئەی ئەگەر پیاوەکە ڕەوشتێکی ناڕەوای هەبوو و نەیتوانی مال بەڕێوە بەرێ ئایا ژنیش نابێ هەمان مافی هەبێ ؟

بەلام لە لایەکی تریشەوە لە ئەنجامی کاردانەوەی ئەم واقعە نالەباردا، هەلچووانە و بێ بیکردنەوە...داوای هەمان ماف بو ژنیش بکەین ئەوە دیارە هەڕەمەکیەکی

گەورە لە کۆمەلگەدا دروست دەبێ...کە هیچ کەس و هیچ کۆمەلگەیەک پێی ڕازی نابێ و پێشی بەختەوەر نابێ ، بەلکو کۆمەلێ گیروگرفتی یاسایی و ئەخلاقی و کۆمەلایەتی و تەندروستی دێنێتە کایەوە .. لە و بارەدا ئامانجەکە کە ڕزگارکردنی ئافرەتە لەناو دەچێ ... کەواتە باشتر وایە کە پیاو واز لەو مافە (( ئەگەر پێشیدراوە )) بهێنێ.

* زۆری ڕێژەی ئافرەت لە چاو پیاودا لە ئەنجامی شەڕ و جەنگدا.

(ئەوە ئاشکرایە کە دیلی جەنگ و سیستەمی کۆیلایەتی لەو ڕۆژگارەدا لە پێش هاتنی ئیسلام و لە دوای هاتنی ئیسلامیش، هۆکارێکی تر بوون بۆ سەرهەلدانی نەریتی (فرەژنی)، کە لە قورئاندا ئەمانە بە **ما ملكت ايمانكم**، ناوزەندکراون. بەلام دەبێ لەوە ئاگاداربین کە مادەم ئەمڕۆ ئەم سیستەمە بەسەر چووە، بیانوو هێناوە بۆ نەریتی فرەژنی کارێکی سەرنەکەوتوە.

جگە لەوەش ئەم ئەرگومێنتە یان ئەم بیانوە بۆ کۆمەلگەیەک و زەمانێک کە ئافرەت هیچ توانا و ئاستێکی کۆمەلایەتی و هیچ هەل ومەرجێکی وای بۆ نەگونجا بێ کە بتوانێ خۆی سەرپەرشتی خۆی ومندالی بکات، تا ڕادەیەک ڕەوا بێت ... بەلام چەندن ڕێژەی ئەو پیاوانەی کاتێ دەیانەوەێ ژنی دوەم یان سێهەم بهێنن، ئەو ئافرەتە بێ سەرپەرشت و بێلانانە، لە بری کچی گچکە هەلدەبژێرن ؟؟. – کە خۆی ئەمە یەکێک بوو لەو چاکسازیانەی ئیسلام لە کاتی خۆیدا لە سیستەمی فرە ژنیدا کردی _

ئەمڕۆ کە دنیا بەرەو ئەو ئاسۆیە دەڕوات ئافرەتیش بتوانێ بە هۆی پێشخستنی تواناکانی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ وپشت بە خۆی ببەستێ ... پێویستی بە هیچ سەرپەرشتیەکی ڕاستەوخۆ نەبێ ..چۆن دەگونجێ هەمان وەسیلەی زەمان و کۆمەلگەیەک بەکار بهێنین کە هیچ هەل و مەرجێکی سەربەخۆیی و گەشەکردنی توانای ئافرەتی تێدا نەبووبێ و هەموو یاسا کۆمەلایەتیەکان بە باری قورسی ژینگەیی و جەنگ و هێزی بازوو مەحکوم بووبێ.

* بەلام، ئایا لە دنیای ئەمڕۆدا کە پڕیەتی لە زانستی دەروونی و کۆمەلایەتی و مرۆیی و ئابووری، گوایا ناتوانین ژنێک کە کەم وکورتیەکی هەیە لە بەڕێوەبردنی خێزاندا، ووریای بکەینەوە و بە هەمووومان یارمەتی بدەین تا ئەو گرفتانەی کە بونەتە –هۆی بیانوو بۆ مێردەکەی کە هەندێ جار لەوانەیە گونجاو بێ– لە بری ئەوەی ژنێک و دوانی تر بکەین بە گژیدا و کەرامەتی بشکێنین....!!بە دوای چارەسەر و گۆڕانیدا بگەڕێین ..ئایا ئەمە ئەو دادپەروەریە نیە کە سێجار لەوتێکستەدا بانگەوازی بۆ ئەکا .

* ئایا ئەگەر فرە ژنی ڕێی لێبگیردرێ لە بەرکەم کردنەوەی ئەو گرفتە دەرونیانەی کە لە ئەنجامیدا درووست دەبن وەک منافەسە و ڕقەبەرایەتی لە خێزانێکدا، نزیک تر نیە لە ڕەزامەندی خواوە ؟؟

* دیاره نەبوونی خۆشەویستی گەورەترین گرفتە لە ژیانی هاوسەریدا، بە تایبەتی ئەگەر پیاو وا تێ بگات کە لە لایەکیترەوە مافێکی تری لە ئاسمانەوە پێدراوە، ئیتر چۆن بیر لە خۆشەویستنی ژنەکانی دەکاتەوە.

* ئایا ئەگەر ژیانی هاوسەری لەسەر بناغەی خۆشەویستی دامەزرێ چ پیاوێ دەستی دەچێتە ئەوەی لە هەر حال و بارێکدا بێ هەر بیانوویەکیشی هەبێ ژنێکی تر بێنێ ؟؟ ،، یان ڕازی دەبێ بەوەی کە هەیە و دەگەڕێ بە دوای چارەسەر و ڕێکەوتندا.؟؟

*ئەگەر پیاوێک هەر وویستی ژنێکی تر بێنێ ئایا تەلاق دان لەو حالەتەدا دادوەرانە تر نیە ؟؟ هەروەک لە تێکستەکەی تردا قەدەغە لە پیاوان دەکات کە ژن بە هەلپەسێرراوی بهێلنەوە. ((... فلا تميلوا كل الميل فتذروها كالمعلقة و ان تصلحوا و تتقوا....)) 3*. النساء 129. تا ژنیش (ئافرەت) هەست بە کەرامەتی خۆی بکات بتوانێ (ئەگەر وویستی) ئازاد بێ و بڕیاری جیا بونەوە بدات و یاسا و کۆمەلگە لەو حالەتەدا نەبنەڕێگر لەبەردەم ئارەزووی ڕاستەقینەیدا! بەلکو ڕێز لە بڕیارەکەی بگرن و لە لایەکی ترەوە بتوانێ ژیانێکی تر بێ هاوسەری یان هاوسەرداری پڕ لە ئاسوودەیی بۆ خۆی دروست کات دوور لەو غەیبەت و حەسادەت و منافسە و ڕقەی کە لە نێوان ئەو دوو ژنە بەستەزمانانەدا دروست دەبێ... جگە لەو بارو دۆخە دەروونیە نادروستەی کە لە منالەکانیاندا دروست دەبێ....

یان هەتا هەتایە هەر لە جەنگ و دووبەرکیدا بژین یان لە لایەن باوکە کەوە بۆ ئەوەی دەسەلاتی بەسەریاندا بشکێ ، سەرکوتو داوماو دەکرێن .... ئەمە هەمووی لە پێناوی حەز و غەریزەی پیاوێکدا ..

ئایا تەلاق دان و جیابوونەوە لە سەر بناغەی لەیەک گەیشتن و بەرژەوەندی هەردوو لا و ڕووبەڕوو بونەوەیەکی ڕاستگۆیانە لەم حالەتانەدا دادپەروەرانە تر نیە؟؟

* ئایا ڕاست تر و دروست تر نیە کە هەولی ئەوە بدرێ ئافرەت هۆشیار بکرێتەوە و بە مشتێ ئالتوون ڕازی نەبێ ... –لە بری ئەوەی ژنی بەسەردا بێ –خۆ ئەگەر ڕازیش بوو با ڕێز و نرخی خۆی بە ماددە نەگۆڕێتەوە. چونکە لە بەهای مرۆڤانەی خۆی کەم دەکاتەوە ..

* ئایا بۆ دەبێ ئەو تێکستەی – النساء 3 کە ڕێگە بە فرە ژنی دەدات ئەوەندە خواس وباسی –لای لایەنگرانی فرە ژنی و ئەوانەشی دژی فرە ژنین – هەبێ، بەلام ئەو تێکستەی تر النساء 129 کە هۆشیارمان دەکاتەوە لە لایەنی نێگەتیڤی فرەژنی خواس و باسی نەبێ. کێ بەرپرسیارە لە دروستکردنی حالەتێکی ئەوا ناهۆشیارانە؟

* ئایا ناکرێ حوکومەت سەرپەرشتی ئەو ژنانەی کە لەبەر بژێوی ژیان یان لە بەر شورەیی تەلاق ڕازی دەبن کە ژنیان بەسەردا بێ، باوەش بۆ خۆیان ومندالیان بکاتەوە....تا ژنان هەست بە پشت و پەنای دەسەلات و کۆمەلگە بکەن. تاکەی ئافرەت لە پێناوی بژێوی ژیانی خۆی و مندالەکانیدا بێتە قوربانی .... مرۆڤی دلشکاو هەرگیز ناتوانێ وەکو پێویست کاریگەر بێ لە پەروەردەکردنی مندال و پێگەیاندنی نەوەی داهاتوو دا......

<u>فرەژنی پێغەمبەر</u> : بە بۆچوونی من لەم ململانێیەدا مەسەلەی فرەژنی پێغەمبەر نە پێویست دەکات بەرگری لێ بکرێ و بیانووی بۆ بهێنرێتەوە و نە ڕەخنە و هێرش کردنە سەرییشی ڕەوایە، چونکە ئەو مەسەلەیەش دیسانەوە پەیوەندی بە بار و دۆخی ئەوکۆمەلگەیەوە هەیە بەلگەشمان لەوەدا ئەوەیە کە کەس نە لەکاتی خۆیدا و نە دوای خۆیشی سەبارەت بەو مەسەلەیە تەشەنە و ڕەخنەی لێنەگرتوە ... بگرە مەغدووریش دەبێ ئەگەر بێتوو ئەو بەراوورد بکەین بە سەرکردە و پاشاکانی ئەوسەردەمە خۆی، سەرەڕای ئەوەش ڕەوانیە کەسێک کە هەزار سال لەمەوبەر ژیا بێ، بە پێوانەکانی ئەمڕۆ بیپێوی ........ ئەویش پیاوی ئەو زەمەنەی خۆیەتی و هەرچەند لەوان جیاواز بێ و هەولی گۆڕان بدات .. هەر شتێک لە کاریگەری ئەو کەلتوورەی لەسەر دەمێنێ .......بۆیە نموونەیی پێغەمبەر لەوەدا بوو وەک کەسێکی هۆشیار توانی لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا لە و زەمەنەدا بە بێ هیچ وەسیلەیەکی زانستی و تەکنەلۆجی و میدیایی ئەو کۆمەلگە نەزان و پەرتەوازەیە کۆ بکاتەوە و هۆشیاریان بکاتەوە لە ناسنامە و نرخی خۆیان و کۆمەلگەیەکی مەدەنی (( بەبەراووردکردن لەگەل کۆمەلگاکانی تری ئەو زەمەنەدا )) دروست بکات و بە دنیادا بلاویان بکاتەوە .... ئیتر کاتێ هەلەو و ناتەواویشیان هەبووبێ ، ئەوە تاوانی ئەو نیە و تاوانی هیچ شۆڕشگێڕێکیش نیە.

### * نایەکسانی لە نێوان نرخی شایەتیدانی ئافرەت ونرخی شایەتیدانی پیاو –لە هەندێ کاروباری ژیاندا–

**البقره 282**

((.... واستشهدوا شاهدین من رجالکم فان لم یکونا فرجلین وامراتان ممن ترضون من الشهداء ان تضل احداهما فتذکر احداهماالاخری.))

(( ... با دوو پیاو لە خۆتان شایەتی لەسەر ( قەرز و مامەلە ) بگرن ، ئەگەر دوو پیاو دەست نەکەوتن با پیاوێک و دوو ئافرەت شایەتیەکە بدەن لو کەسانەی کە ڕازین بە شایەتی دانیان . نەوەکو یەکێک لە( ئافرەتەکان) بیری بچێت، با ئەوی تریان بیری بهێنێتەوە .........))

شایەتی دان لە بواری قەرز و کاروباری ئابوری و مالی4* و زۆربەی بوارەکانی تردا ئافرەت و پیاو یەکسان نین. بەلام بواری تریش هەن کە شایەتی ئافرەتان یەکسان دەبێ بە شایەتی پیاوان ئەویش ئەو بوارانەیە کە تەنها پەیوەندی بە ژنانەوە هەیە. ئەم حوکمە هێندەی پەیوەندی بە ڕۆلی دیاریکراوی ئافرەت و نەبونی ئەزمونیان – بە شێوەیەکی گشتی– لە هەندێ بواردا– هەیە، هێندە پەیوەندی بە ئەقل و خودی کەسێتی ئافرەتانەوە نیە. بەلام هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە ئەگەر لە کۆمەلگەیەکدا بە هیچ شێوەیە نەتوانرێ وێنای ئەوە بکرێ کە ئافرەت دەتوانێ ئەرکی شایەتی دان لە مەسەلەگەورە و هەستیارەکانی دادگادا ببینێ. بێگومان هیچ گۆڕنکارێک ناتوانێ بە یەک هەنگاو ئەو کۆمەلگەیە وای لێبکات ئەووێنایەی بە تەواوی بگۆڕێ و ئەرکی شایەتیدان بە ئافرەت–بێ هیچ یارمەتیدانێک لە لایەن کەسیاتیەکی وەک خۆی– قبول بکات. بە تایبەتی کە ئافرەت تا ئەو کاتەش هیچ بوارێکی وای نەبوە کە ببێتە خاوەن ئەزموون و شارەزایی لە مەیدانە جیاواز و ئالۆزەکانی کۆمەلگەدا. کەواتە ئەگەر هەر سەردەمێ ڕۆلی ئافرەت فراوانتر بوو و ئەزموونی لە کاروبارەکاندا پەیدا کرد، پێویستە لەسەر یاسادانەران کە کایەی ئەرک و مافی ئافرەتان لە شایەتیداندا، فراوانتر بکەن نەک وەک ئێستە بیوەستێنن. کاتێ ئەو سیستەمە کۆمەلایەتیە دەگۆڕێ و ئافرەت لە زۆر بەی یان هەموو مەسەلەکانی تری کۆمەلگەدا ئەزموون و شارەزایی خۆی دەسەلمێنێ، ئایا هەر ئەوکاتەش دوو ئافرەت بە یەک شایەت وەرگرین؟؟ ئایا دوو دکتۆر ، دوو مامۆستا، دوو وەزیری ئافرەت بە یەک شایەت لەقەلەم بدەین .. ئەمە بە کێ و بە چ فەلسەفەیەک ڕەوایە؟؟

هەندێ جار ئەوەمان گوێ لێدەبێ کە دەوترێ: شایەتی دان، هێندەی ئەرکە هێندە ماف نیە، لەبەر ئەوە هیچ بەلگەیەک نیە بۆ ئەو ڕەخنەیەی کە لەم تێکستە دەگیرێ. ئەمە ڕاستە دەشکرێ بلێین سیستەمی بیرکردنەوەی کۆمەلگەی ئیسلامی ویستویەتی ئافرەت لەم ئەرکە قورسە بپارێزێ. بەلام بۆ ئەم سەردەمە ئەو هاوکێشەیە قبول ناکرێت، چونکە ئافرەتان ئەیانەوێ لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیاندا لە کۆمەلگەدا مافیان هەبێ. چونکە متمانە پێکردن لە ئەرک جێبەجێکردندا دەچێتە ڕیزی مافەوە و وەک پیاوان ئەوانیش دەبنە ئەو مرۆڤەی متمانەیان پێدەکرێت و کاریان پێدەسپێررێت.

## ⁕ دانانی  پیاو وەک ڕاستکەرەو سەرپەرشتیکار و هەلسوڕێنەری کاروباری ئافرەتان النساء 34

(( الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض و بما انفقوا من اموالهم ....))

((پیاوان کارساز و سەرپەرشتی ژنانن، لەبەرئەوەی خوا هەندێک لەوانەی بەسەر هەندێکا فەزیلەت داوە، وە لەبەرئەوەی پیاوان لە مالی خۆیان نەفەقەی ژنانیان ئەدەن .....))

ئەرکی سەر پەرشتی و کارسازی ئافرەت لە لایەن پیاوە وە حوکمی ئەم تێکستە نیە بەلکو حوکمی کەلتوورێکە کە کەلتورە ئایینەکانی ئەو ڕۆژگارە لە پێکهاتەیدا بەشدار بون. بۆیە کەلتورێکی سەرتاپاگیری هەبوە و هەر بەو شێوە هەرەمیە سەیری پەیوەندی پیا و ئافرەتیان کردووە بۆ نموونە ئیجیل لەوەش زیاتر دەڕوات و دەلێ: ((خوا سەری مەسیحە و مەسیح سەری پیاوە و پیاویش سەری ئافرەتە ... )) – سەر لێرەدا بە مانای سەروەری دێت – جا کاتێ کەلتوری کۆمەلگەی ئیسلامی  کارسازی و سەرپەرشتی کردن و ڕاستکردنەوەی  ئافرەت (**قوامە**) بە ناوی ئەم تێکستەوە دەداتە دەست پیاو، هیچ جیاوازیەکی نیە لە زۆر لە کەلتور و ڕۆژهەلاتیە دواکەوتوەکانی تر کە بە هەمان شێوە بیردەکەنەوە. ئەوەی زیاتر ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ:

ڕستەکە لەسەر شێوەی ((خبری))ە و ((**انشائی**)) نیە واتە بەم شێوەیە **(( الرجال قوامون على النساء ))** نەک **(ايها الرجال كونوا قوامين على النساء)** جیاوازی ئەم دووانە ئەوەیە یەکەمیان لە واقعێک دەدوێ  دووەمیان فەرمانێک دەدات.

⁕ فەزلدانەکە .. فەزلدانی پیاو نیە بەسەر ئافرەتتدا، بەلکو فەزلدانی هەندێکە بەسەر هەندێکی تردا چونکە ئەگەر وا بوایە دەستەواژەکە لە بری ((...**بما فضل الله بعضهم على بعض...**)) **((بما فضل الله  الرجال على النساء** )) دەبوو بەوش مەجال دەهێلێتەوە بۆ  کاتێک ئەگەر ئەرکی سەرپەرشتی و کارسازی ئافرەت لە دەستی پیاودا نەما یان بەشێوەیەکی هاوسەنگی لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا  بوو .... ئەوا فەزلدانەکە کەش دەبێ هاوسەنگ بێ ... .

⁕(( بما انفقوا من اموالهم)) لەم تێکستەدا ئەوە دەگەیەنێ هۆی کارسازی و ڕاستکردنەوەی  ئافرەت لە دەست پیاو دا پەیوەندی تەنها  بە یەک فاکتەر و بابەت و شوێن (( خێزان و بژێوی ژیان )) ەوە هەیە نەک لە ڕووی خودی عەقل و بیرکردنەوە و بەهای ئافرەت وەک ئافرەتەوە بێ.

⁕ لە ڕۆژگارێکدا بازو و هێزی لەش و جەنگ و تۆلەسەندن و مانەوە  لۆژیک و پێکهاتەی بیرکردنەوەی تاکەکانی کۆمەلگە بوو بێ ، دیارە ئافرەت و((هەروەها خێزان)) لە ڕووی پارێزگاری و دابینکردنی بژێوی ژیان پێویستی بە سەرپەرشت و کارساز و ڕاست کەرەوە بووە. کەواتە قەوامە ئامانج  یان ماف نیە بەلکو ئەنجامی

فاكتەری كەلتوری بووە – بە هۆی ئەو ئەركەوە كە تەنها پیاو پێی هەلساوە – هەر كاتێ ئەو فاكتەرە نەما یان هاوسەنگی لە ئەركدا دروست بوو ئەو ئەنجامەش نامێنێ ..... هاوسەنگی لەو (قەوامە)شدا دەبێ دروست بێ.
ئەوەی لەم تێكستەدا بۆ ئێمە دەمێنێتەوە پەیامێكە كە ئەوەیش ڕاگرتن وپاراستنی خێزانە، ئامرازی ئەم پەیامە بە پێی گۆڕانی كۆمەلگە و ئەركەكانی ژن و پیاو دەگۆڕێ. دەشێ دوێنێ (( هێلانەوەی قەوامەی پیاو لەگەل هەندێ ڕاست كردنەوەدا)) ئامرازێكی گونجاو بووبێ بۆ هێنانەدی ئەو پەیامە بەلام ئەمڕۆ بۆ ئێمە بە شێوەیەكی تر و بە ئامرازیكی تر ئەو پەیامەمان بۆمان بێتە دی. كە ئەویش هاوسەنگی كردنە لەو قەوامەدا لە نێوان هەردوو ڕەگەزەكەدا .

## * لێدانی ئافرەت ا لنساء 34

**الاتي تخافون نشوزهن فعظوهن و اهجروهن في المضاجع و اضربوهن فان اطعنكم فلا تبغواعليهن سبيلا**))*.

بەلام ژنانێ كە بەرز دەفڕن و ئەترسن نافەرمانی تان بكەن ، لەبەرا ئامۆژگاری یان بكەن، (لە پلەی دووەمدا) جێیان لێ جیا بكەنەوە جا لە (پلەی سێهەمدا ) لێیان بدەن و تەمبێ یان بكەن، بەلام ئەگەر بە قسەیان كردن، ئێوەش ( بیانوویان پێ مەگرن ) ڕێی ستەم كردن لەوان مەگرنە بەر))
بۆ تێگەیشتن لەم دەستەواژەیە دەبێ دیسانەوە بگەڕێینەوە بۆ ئەو سەردەمەی كە تێیدا هاتۆتەكایەوە.
دیارە لە كۆمەلگەیەكدا كە هێز و بازو جەنگ و تۆلە و مانەوەی قەبیلە لۆژیكی بیركردنەوە بووبێ و تەنها پیاو پەیداكەری بژێوی و پارێزەر ژیان بووبێ و.. ... ئافرەتیش لە هەموو گەورەو بچوكێكدا پێویستی بە پیاو یان (بەو باز و هێزە) دەبێ و هیچ هەل و مەرجێكی هۆشیاری و ڕۆشنبیرانەی بۆ خۆڕزگار كردن لە ژێر ئەم دەسەلات و ئەقلەیەتەدا نەڕەخسابێ .. كە بە تەنها هەلێك (( وەك هاتنی ئیسلام )) دەڕەخسێ .. بەرەو ئەوە دەچێ كە هەندێ لە و دەسەلات و پیرۆزیە لە پیاو بسەنێتەوە ...سەرەڕای ڕەوایی ئەو گۆڕانكاریە بەلام بە ناچاری دوو گرفت دروست دەبێ، یەكێكیان زوو هەزم نەكردنی ئەو بارە تازەیە لە لایەن پیاوەوە . دوەمیان خراپ بەكارهێنان و ئەو ماف و دەسەلاتە تازە پێدراوە ....(( كە خۆی لە خۆیدا ئافرەتانی تێگەیشتو و پێگەیشتوو دەزانن چۆن بەكاری بێنن بۆ خزمەتی خۆیان و خێزان و كۆمەلگەكەیان ))، بەلام لەلایەن هەندێ لە ئافرەتان كە لە بیركردنەوەیاندا پێگەییو نین و هەندێ خەسلەتیان هەیە كە زیان بە خێزان دەگەیەنێ وەك بەرزفڕین و ئیسراف كردن و زیادەڕەویكردن لە بەكارهێنانی ئەو ماف و دەسەلاتەدا. ئەم خەسلەتانە نەخۆشی دەروونین و دەبێ چارەسەر بكرێن ... لەو بارودۆخەی ئەو كاتەی ئەو كۆمەلگەیە ئامۆژگاری كردنی ڕاستەوخۆ و تۆراندن و لێدان تەنها وەسیلەیەك بوون بۆ چارەسەركردن یان بێدەنگكردنی

ئەو توێژە لە ئافرەتان کە بە پێی بۆچوونی ئەوکاتەی ئەو کۆمەلگەیە، (نەشاز بوون ) ( بەرزفڕیون و نافەرمانیان کردون ) .

هۆکاری هاتنەدی ئەم تێکستەش ئەم ڕووداوەیە کە کە لە ( **ابن كثير**) **دا 5*** هاتووە (( ..جارێ لە جارەکان کە پێغەمبەر قسە بۆ خەلک دەکات و ئامۆژگارییان دەکات کە ..نابێ لە ئافرەت بدەن ....!! دوای ماوەیەک عومەری کوڕی خەتتاب (خوالێی ڕازی بێ) دێ بۆ لای و دەلێ ئەوە ژنان خەریکن تەنگ بە پیاوان هەلدەچنن ....لێرەدا پێغەمبەر ( د.خ) ڕێگەیان پێدەدات کە لێیان بدەن ...... دوای ئەوە ژنان دێنەوە بۆ مالی پێغەمبەر بۆ سکالا کردن .. ئەویش بە جارێکی تر کە قسە بۆ پیاوان دەکات ژنانێکی زۆر هاتوون لە مالەوە شکاتیان لێ کردووە کە لێیان دەدەن .ئەوانەی وا لە ژن دەدەن چاکەکانتان نین.
لێرەدا ئەوەمان دەردەکەوێ کە دیاردەی لێدان وەک پرەنسیپ ناڕەوایە، بەلام هەموو جارێ لەواقعدا پرنسیپەکان وەک یەک جێ بەجێ ناکرێن. واتە کەلتوور بە ئاسانی نا گۆڕدرێ. با بە ناوی ئەو پرنسیپە بە ناوی خوا و پیرۆزگەرایشەوە بێت. چونکە هەمیشە لە سەرەتای گۆڕانکاریدا خراپ بەکار هێنان دروست دەکات. واتە تا ئەو پرەنسیپە بەسەر لایەکدا دەسەپێنی، لایەکەی تر لە پرنسیپێکی تر لا دەدات.
کەواتە لێدانی ئافرەت نیشانەیەکی کەلتوری باوک سالاری عەرەبی و کۆمەلگاکانی تری ئەو ڕۆژگارە بوە، ئیسلام نەیتوانی ئەو نەریتە باووک سالاریە کە هەلشێلاوی کۆمەلێک هۆکار و بیر و بۆچون و بار ودۆخی ئالۆزە – لەبەر نەبوونی هەل ومەرجێکی یاریدەدەری تر وەک زانستە مرۆییەکانی ئەمرۆ – ..لە ماوەیەکی وا کورتدا لابەرێت و بە تەواوی بن بڕ بکات ، هەر ئەوەندەی پێکراوە کە بلێ ( ئەگەر لێشتان دان با لێدانی سوک بێت کە ئازاریان پێ نەگات ( هەرچی سەردەمەکانی دوای سەردەمی یەکەمی ئیسلامە....بە هۆی سەیرکردنیان بۆ قورئان بە شێوەیەکی حەرفی و نیوەچلی. و تێکەلکردنی هۆکار و ئامانج، ئامرازیان لێ بوە ئامانج. واتە لە کاتێکدا لێدان ئامرازێک بوو بۆ هێنانەدی ئامانجێک لای ئێمەبوو بە ئامانج و بەجێهێنانی ڕەزامەندی خوا .
* ئایا ئێستە لەم زەمەنەدا کە پڕیەتی لە وەسیلەی زانستی دەروونی کۆمەلایەتی نەگونجاو نیە ؟ هێشتا باس لە ئامرازێک بکەین و نەتوانین هەموو ئەو زانستانە وەک ئامازێک بەکاربهێنین و چ پیا ز چ ئافرەتیش لە نەخۆشیە دەرونیەکان ڕزگار بکەین کە خۆی ئەمە پەیامی تێکستەکەیە وەسیلەکانی ئەم پەیامە دەشێ بۆ دوێنێ تا ڕادەیەک ! بەکەلک هاتبێ بەلام بۆ ئەمرۆ بە هیچ شێوەیەک بەکەلک نایەت و نامانگەیەنێتە هەمان ئامانج. ئەگەر ناشتوانین ئەوە بکەین ، ناڕەواشە بە لێدان بۆ مرۆڤ ناوی خواوە، بانگەوازی بۆ بکرێ.

چۆن دەگونجێ ئامرازی زەمەنێک و کەلتوورێک کە خاوەنی هیچ هۆکارێکی هۆشیارکردنەوە و زانستێکی مرۆیی و دەروونناسی نەبووبێ و نەیناسی بێ، بەکار بهێنینەوە.

## * بڕیاری هەلوەشاندنەوەی هاوسەرگیرێتی -الطلاق- پیاوسالاری

ئەم حوکمە لە چەند تێکستێکدا دەبینینەوە.

(( **البقره 228، 229، 230 ، 231، 236 ، 237 _ الاحزاب 49 ....، _ الطلاق1**))...

.بەلام لێرەدا تەنها دوو تێکست بەنموونە دێنینەوە:

(( **.... و بعولتهن احق بردهن في ذلك ان ارادوا اصلاحا ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف و للرجال عليهن درجة والله عزيز حكيم**)) **البقره 228** *

((... مێردەکانیان ( لە پیاوانی تر ) سازاوترن کەلەماوەی عیدە دا – کە سێ مانگە – بیانگێڕنەوە ئەگەر مەبەستیان ئاشتی بێ، ژنان مافیان لەسەر پیاوان هەیە، هەروەها کە پیاوان لەسەر ژنانیان هەیە ، وە بۆ پیاوان پلەیەک مافی زیاتر هەیە ...))

(( **و اذا طلقتم النساء فبلغن اجلهن فامسكهن بمعروف او سرحوهن بمعروف ولا تمسكوهن ضرارا لتعتدوا و من يفعل ذلك فقد ظلم نفسه .... 231**

(( وە هەر کاتێ ژنەکانتان تەلاق دا و ئەوانیش بە ئاخرین ڕۆژی عیدەی خۆیان گەیشتن، جا ئەبێ بە چاکی ڕایانگرن یا بە چاکی (لە حزوری دوو شایەتی عادل ) تەلاقیان بدەن ، وە بۆ زیان لێدان و دەس درێژی کردن ( ئاشتیان مەکەنەوە و ) ڕایان مەگرن ، وە هەرکەس ئەو کارە بکات جا بەڕاستی ستەمی لە خۆی کردووە .. )) *

ئەم تێکستەش هەمان علە و هۆکاری لەخۆ گرتوە. پەیوەندی هەیە بە و ڕاستیەی کە لە دروستکردنی ژیانی هاوسەریدا پیاو داواکارە و ئافرەت داواکراوە .... ئەمەش داهێنراوی ئیسلام نیە بەلکو لە زۆربەی کەلتور و کۆمەلگاکاندا هەر وابوە و دەتوانین بلێین وەک ڕێکەوتننامەیەکی سروشتی وایە لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا. لەگەل ئەوەشدا نە قورئان و نەهیچ دینێک مبدئیا ئەو مافەیان لە ئافرەت کە ئەویش داواکار بێ، زەوت نەکردوە.

نابێ ئەوەشمان لەبیرچێ کە لە هیچکام لەو تێکستانەدا ئەوەی تێدا نیە کە تەلاق دەبێ بە تەنها لە دەستی پیاودا بێ بەلکو خیتابەکە بەرامبەر پیاوە !!(( **واذا طلقتم ا ن طلقتموهن، ثم طلقتموهن، ياا يها النبي اذا طلقتم النساء فطلقهن....** )) بە مانایەکی تر جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوەی لە دەقێکی ڕاستەوخۆدا هاتبێ کە (( تەلاق دەبێ لەدەستی پیاو دا بێ )) و لە نێوان ئەوەی کە شتێک خۆی وەک ((زواج و طلاق))ە لە کاتی هاتن و پێش هاتنی ئەم تێکستە تازە لەدەستی پیاودا بوە، ناچار لەم کایەیەدا خیتابەکە دەبێ ڕوو لەو بکات. جگە لەوە ئەو خیتابەی کە لەم تێکستەداڕووی لە

پیاوە ختابێکە لە ڕووی ئیجرائاتی قانونیەوەیە نەک لە ڕووی مافی تەلاق دانەوە بێ. ئەگەر ئەو تێکستە لە (کۆمەلگایەکی ژنسالاری یان دایکسالاریشدا !!!) بهاتایەتە دی .. خیتابەکە ڕووی دەکردە ئافرەت و ئەو کاتە دەبوایە هەمان خوێندنەوەمان بکردایە کە ئێستە دەیکەین ..

بەلام پەیامەکە چیە ؟؟ ئەوەیە (( ئەبێ بە چاکی ڕایانگرن یا بە چاکی تەلاقیان بدەن )) داوای جیابوونەوەیەک دەکات کە لەسەر بناغەی دادوەری و ڕاستگۆیی بێ ... ئەگەر بویسترێ ئەو تێکستە پراکتیزە بکرێ ... دەبێ پەیامەکە لەبەرچاو بگیرێ و خەمی لێ بوخرێ. بۆیە ئەگەر ژن یان پیاو هەرکام خوازیاری جیابونەوە بێ لەوی تر پێویستە، لەو بەلگە و بیانوەکانی ئەو لایەی کە دەیەوێ جیا بێتەوە بکۆلینەوە و هەردوو لاهەول بدەن پرۆسەکە بە دادوەرانە بە رێوە بچێ. نەک کێ تەلاقی بەدەستە.

دیارە دەستەواژەی ( **للرجال علهين درجة** ) واتە (بۆ پیاوان پلەیەک مافی زیاتر هەیە) هێندەی پەیوەندی بە واقعی ئەو کۆمەلگەیەوە هەیە کە مەسەلەی بەرپرسیارێتی لە دابینکردنی بژێوی و دامەزراندن و هەلوەشاندنەوەی هاوسەرگیرێتی لەدەستی پیاواندا بووە، هێندە پەیوەندی بە ستەم کردن لە ئافرەت نیە. چونکە ئەگەر وانەبێ ئەوا ئەم دوو دەستەواژەیە لەم دوو تێکستەدا (( **الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض...**)) و (( **للرجال علهين درجة..** )) دژایەتی دەبێ لەگەل تێکستی ((.. **هن لباس لكم و انتم لباس لهن ..** )) **187البقره واته** ئەوان ( ژناکانتان ) پۆشاکن بۆ ئێوە و ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان هەروەها لەگەل تێکستەکانی وەک **النساء 1 النحل 97 غافر 40** و چەندین تێکستی تر **6***

## * نیوە بەشی (کچی کۆچکردو) لە میراتتدا و مارەیی لە هاوسەرگیرێتیدا النساء 11

((**يوصيكم الله في اولادكم للذكر مثل حظ الانثيين .... وان كانت واحدة فلها النصف ...**))

((خوا ڕێنموویتان دەکات و فەرمانتان پێ دەدا دەربارەی نەوەکانتان ( لە بواری میراتی گرتندا )( ئەویش ئەمەیە) کە بەشی نێرینەیەکیان ئەندازەی بەشی دوو مێینەیانە، خۆ ئەگەر مندالەکان تەنها ئافرەت بوون دووان و لە دووان زیاتر بوون ئەوە دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکە لەوان بەش دەکرێت ، (خۆ ئەگەر مردووەکە ) تەنها کچێکی هەبوو ئەوە نیوەی داراییەکەی دەدرێتێ ....... .))

ئەوەی لەم تێکستەدا ئاشکرایە ئەوەیە کە ئافرەت لە حالەتێکدا کە کچی کەسی کۆچکردوو بێ، نیوەی براکەی میراتی بۆ دەشێ. تەنها ئەم حالەتیەکە کە بەوشێوە ئاشکرایە جیاوازیەکە گوزارشتی لێکراوە. بەلام لە کاتی ووردەکاری و ڕاڤەکردنی

هەموو مەسەلەکان لە کتێبە -فقه -یەکاندا شوێنکی تریشدا جیاوازی هەیە لە نێوان کوڕ و کچدا، ئەویش ئەوەیە کە کوڕێک تاقانە بوو دایکیشی نەبوو ئەتوانێ، ڕێگە بگرێ کە میرات بۆ دەرەوەی خێزان بڕوات ـ بۆ نموونە مام ـ. بەلام کچێک کە تاقانە بێت ناتوانێ ڕێگە بگرێ لەوە. بۆیە بەشێک لەو میراتە ئەچێت بۆ دەرەوەی خێزانەکەی ـ بۆ نموونە مام ـ.

هۆی هاتنە دی ئەو تێکستە بەم شێوەیە یە کە لە (ابن كثير) 7* دا هاتووە (( ژنێک، دوو کچەکەی هێنایە لای پێغەمبەر ووتی : ئەم دووکچە کچی ((سعد کوڕی ڕەبیع )) ن کە لە شەڕی (احد) دا کوژرا ، ئێستە مامیان میراتەکەی باوکیانی داگیر کردووە و هیچیان بۆ نەماوەتەوە . ئەویش فەرمووی خوا چارەی ئەوەش دەکات .... دوای ئەوە ئەم تێکستە هاتە دی ... ناردی بە دوای مامی کچەکاندا ووتی : سێیەکی ئەو مالە بدە بەو کچانە هەشت یەکیش بۆ دایکیان ئەوەشی کە مایەوە بۆ خۆت ....))

دوو ڕاستی لەم ڕووداوەدا تێبینی دەکرێ :

یەکەمیان : لەبەر ئەوەی لەو کەلتووری نیوەدوورگەی عەرەبیدا ئافرەت هیچ مافێکی وەرگرتنی میراتی نەبووە، بەلکو خۆی دەکرایە میرات بە بیانوی ئەوەی کە هەر کەس نەتوانێ بەشداری بکات لە شەڕدا میراتی بەر ناکەوێ8*. بۆیە زەوتکردنی مالی کچان و دایکیان لە لایەن ( مام )یانەوە کارێکی ئاسان و ئاسایی بووە ...تەنانەت لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب خەلک هەبوون هێشتا سەرپێچیان لەم حوکمە دەکرد. دەلێن کەسێک هەبوو پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات ژنەکانی تەلاق دا و مالەکەی بەسەر منالەکانیدا دابەش کرد، عومەر بانگی کرد پێی ووت دەبێ یان بیانگێڕیتەوە، یان دەبێ بەشە میراتەکەیان بدەی. یان دوای مردنت دەلێم پێیان بەرد بارانی گۆڕەکەت بکەن 9*.

جگە لەوە قورئان لە تێکستێکی تردا دژی ئەو کەلتور و تێڕوانیەنە دەوەستێتەوە کە لەو کاتەدا وەک شتو مەک و بابەتی میرات لە ئافرەتی دەڕوانی و ڕەفتاری لگەل دەکرد. یەکێ لەو نەریتانە ئەوە بوە کە ئەگەر ژنێک مێردەکەی کۆچی دوایی بکردایە، ئیتر کەسو کاری مێردەکەی دەستیان بەسەریدا دەگرت، هەموو ئازادیەکیان لێ زەوت دەکرد واتە یان دەبوایە یەکێک لە خۆیان بیخوازێتەوە، یان نەیاندەهێشت هەتا دەمرێ کەس بیخوازێ10*. ئەو تێکستەی دژی ئەم نەریتە دەوەستێتەوە ئایەتی 19 یە لە سورەتی **النساء ((ياايها الذين امنوا لا يحلوا لكم ان ترثوا النساء كرها** ...)) واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ! بۆتان حەلال نیە بە زۆر و بە ئیکراه ژنان بە میرات بەرن ... )).

دووەمیان: ئەم تێکستە گۆڕانکاریەکی -جۆری- بەسەر ئەو سیستەمەدا هێنا نەک -چەندی- واتە ئافرەت و پیاوی یەکسان کرد لە مەبدەئی وەرگرتنی میراتدا بەلام بە چەنیەتی جیاواز – ئەویش تەنها کە کچی کەسی کۆێکردوو بێت-

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ کە  حوکمی نیوە بەشی میرات، لەو دوو حالەتی کە باسمانکرد- هیچ پەیوەندیەکی بە نرخی کەسێتی  و ئەقلیەتی خودی ئافرەت وەک ئافرەت نەبووە. -چونکە ئافرەت ( ئەگەر هاوسەر یان دایکی کەسی کۆچکردوو بێت ئەوا جیاواز نابێ لە پیاو لە مەسەلەی میراتدا. واتە ئەم نیوە بەشە تەنها لە یەک قۆناغی ژیانی ئافرەتدایە ئەویش کچی کەسی کۆچ کردوو ( ابنة) بێت. بەلکو پەیوەندی  بەو سیستەمە کۆمەلایەتی و ئابوریە گشتیەی کە هەموو کۆمەلگەی گرتبووەوە کە بە شێوەیەکی گشتی ئافرەت خەرج کەر (( مستهلک )) بوە نەک بەرهەمهێنەر (( منتج )). لە ڕووی ماددیەوە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا -وەک کچ - بژێوی بۆ دابین کراوە و بە خێو کراوە. سەرەڕای ئەوەش لە هاوسەرگیرێتیدا مارەیی وەگرتوە. بۆیە بەم شێوەیە تای تەرازووەکە تا ڕادەیەک ڕێکدەبێ. بەلام کە تا هەبوو هەلومەجەکان دەگۆڕێن و ئافرەتیش خۆی بەشدار دەبێ لە پەیداکردنی بەشێک لە داهاتی خۆی و خێزانی و کۆمەلگەش، ناکرێ ئەو حوکمە هەتا هەتایە هەروا بهێلینەوە و یاسای لەسەر داڕێژین ، بەلکو دەبوایە ئێمە لەو پەیامەی کە لەپشت  ئەو تێکستە_ حوکمە- وەیە  تێبگەیشتینایە و سەرنجی ڕابکێشاینایە و هاندەرێک بوایە بۆ هەنگاو نانی زیاتر نەک لە شوێنی خۆماندا بمانچەقێنێ. ئەو پەیامەش ئەوەیە کە ئافرەتی هێنایە ڕیزی پیاوە وە لە مەبدەئی وەرگرتنی میراتدا، بەلام بە چەندێتیەکی کەمتر لە پیاو ئەویش لەبەر ئەوهۆکارەی کە باسکرا  کاتێ ئەو سیستەمە کۆمەلایەتی و ئابووریە دەگۆڕێ دەبێ حوکمەکانیش بگۆڕدرێ .

کەواتە ئەگەر ئافرەت بیەوێ بەشی تەواوی  لە میراتی مالی باوکیدا هەبێ، دەبێ بە مارەیی وەرنەگرێت و بەشدار بێت لە پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیرێتی تا وای لێدێت نەلە مالی باوکیدا نیوەبەشی دەبێ و نە لەکاتی دروستکردنی ژیانی هاوسەریشدا بە مادده و دراو و زێڕ نرخی بۆ دیاری ئەکرێ..

چونکە مارەییش ئامانج نیە بەلکو ئامڕازێکە (( بۆ بەخشینی دەسەلآتێکی ئابووری بە ئافرەت لە بەرامبەر  دەسەلآت و ستەمی پیاودا )) لەگەل زیاد بوونی ڕادەی هۆشیاری و هەستی مرۆڤایەتی لە لای هەردوو ڕەگەزەکە  بەرامبەر بەیەکتر پێویستیمان بەو ئامڕازەش کەم دەبێتەوە ....

## *دانانی ئافرەت لە ڕیزی شت و مەکدا   ال عمران 14

{ زُيِّنَ لِلنَّاسِ  حُبّ الشَّهَوَات مِنْ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِير الْمُقَنْطَرَة مِنْ الذَّهَب وَالْفِضَّة و الخيل المسومة و الانعام و الحرث  ذلك متاع الدنيا }

(( ئارەزو و حەزی خەلک بۆ ژنان  و نەوەی نێرینە و کۆکردنەوەی زێڕ و زیوی زۆر و زەبەندە و ئەسپی چاک مالات و زەوی و زاری کشت و کال بۆ خەلکی ڕازێنراوەتەوە ..ئەمانە شتو مەکی دنیان .... ))

دانانی توێژی ئافرەت لە ڕیزی ئەو شت و مەکانەی کە ناویان هاتووە داهێنراوی قورئان نیە بەلکو ئەوەواقعێک بووە لەو کەلتوورەدا کە تاکەکانی خولیا و ئارەزووویان لە کۆمەلێک بابەت بوە لەوانە ژنی زۆر نەوەی زۆر لە ڕەگەزی نێرینە و زێڕ و زیو ئەسپی جوان زەوی و زار و شانازیان پێوە کردوە و خۆیان پێوە هەلکێشاوە ..ئەم لۆمەی ئەو نەریتە دەکات. هیچ پەیوەندی بە کەم نرخی ئافرەتەوە نیە بەلگەش بۆ ئەمە ئەوەیە ڕەگەزی نێرینەش لە هەمان ڕیزدا باس کراوە. جگە لەوەش ئەگەر وا نەبێ ئەوا ئەم تێکستە بە تەواوی دژی ئەو تێکستەی تر دەبێ کە دەلێ :(( **یاایها الذین امنوا لا یحلوا لکم ان ترثوا النساء کرها** ...))**النساء 19** واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ! بۆتان حەلال نیە بە زۆر و بە ئیکراه ژنان بە میرات بەرن ... ))

دیسانەوە ئەمەش ئەو واقعە دەگەیەنێ کە ژنان لە کەلتووری ئەو کاتەی نیوە دوورگەی عەرەب نەک هەر میراتی وەرنەدەگرت بەلکو وەک شتو مەک دەبوە میرات. واتە پەیامی تێکستەکە بریتیە لە لۆمەکردنی پیاوان لە پشبرکێ کردن و خۆهەلکێشان بەو شتومەکانەوە و هەروەها ژن وکوڕیش کە لەو کەلتوورەدا لەو ڕوە وە لە ڕیزی ئەو شتانەدا بوون .... واتە کۆمەلگە خۆی ئەو بابەتانەی لە ڕیزی ژن و نەوەی زۆردا داناوە. هەر کاتێکیش ئە و شتانە ببنە ئەولەویەتی مرۆڤ و زیادەڕەوی کردن لە هەولداندا بۆ وەدەستهێنانی بە مەبەستی شانازی پێوە کردن و خۆ هەلکێشان بە تایبەتی ئەگەر مرۆڤ ژن و کوڕ لەو ڕیزەدا بوون ئەوە هەموو بیرێکی مرۆڤانە و ئایینێک لۆمەی دەکات .

## * وەسفکردنی وەک کێلگەیەک بۆ مندال بوون البقرە **223**

(( نساءکم حرث لکم فاتوحرثکم انی شئتم و قدموا لانفسکم و اتقوا الله ... .))

(( ژنەکانتان ( لەکاتی پاکیدا ) کێلگەن بۆ تان ( شوێنی بەرهەم هێنانی وەچە) ، کە وا بوو هەر زەمان و هەرشێوەیە بتانەوەێ ( لە پاکیدا ) دەسیان لەگەل تێکەل بکەن، ( بەرو بۆوەکەی کەمنداله) بۆ خۆتان پێش خەن لە خوا بترسن.... . ))

دیارە ئەمڕۆ وتنەوە و ڕەفتارکردن بەم تێکستە بەم شێوە حەرفیە، لەگەل هەولەکانی ئافرەت بۆ وەرگرتنی ڕۆلی نوێ لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا کە کۆمەلگە پێوستیەتی، دژایەتی دەبێ و وێنەیەکی نەگەتیڤ لە دەروونیدا دەکێشێ... ئەم تێکستە پەیوەندی هەیە بە تێکستێکی پێش خۆی کە لەوێدا پیاوان لە جووتگیری لە گەل ژنەکانیاندا قەدەغە دەکات لە کاتی دەورەی مانگانەدا – لەبەر ئەوەی زیان بە باری تەندروستی و باری دەروونی ئافرەت دەگەیەنێ.

وەسفکردنی ئافرەت بە (( حرث)) 11* لە زمانی عەرەبیدا بە مانای کێلگە و کشت و کال کە مانایەکی بایەخداری هەبوە دەگەڕێتەوە بۆ ... ئەو ڕۆلەی کە ئافرەت

لەو کاتەدا  بە شێوەیەکی گشتی  هەیبوە، لە منال بوون و بەخێوکردنیدا وەسفکردنێکی ئاوا لەو سیاقە بۆ بیرخستنەوەی ڕێزی ئافرەت بە شتێک کە لایان گرنگ بووە، بۆ ئەو ڕۆژگارە دیارە لە جێی خۆیدا بووە ..بەلام ئەمڕۆ بە هۆی گۆڕانی هەموو باروودۆخەکان هەروەها گۆڕانی ڕۆلی ئافرەت لە بەشداری کردنیدا لە زۆر لە کایەکانی تری ژیاندا دەشێ ئەو وەسفە دەست نەیات...

پەیامی ئەم تێکستە بۆ ئێمە لە وەدایە کە وەسفی ئافرەت بە شتێک دەکات لەو کاتەدا گرنگ بوە و لەگەل ڕۆلی خۆیدا گونجاو بووە ..ئەگەر ئەمڕۆ وەسفێکی تر بۆ ئافرەت بە پێی ئەو ڕۆلەی کە ئێستە دەبینێ، بکرێ، هیچ دژایەتیەکی لەگەل ئەم تێکستە نابێ. چاوەڕێکردن لەوەی لە کۆمەلگەیەک یان کەلتوورێکدا وەسفێک بۆ ئافرەت بێتەدی کە لەگەل هەموو زەمانێکدا بگونجێ یان –گلەییکردن لەوەی کە نەهاتۆتەدی– چاوەڕوانیەک و گلەییەکی نادروست و ناڕەوایە.

## * دیاردەی حجاب   ((بالاپۆشی))

هەرچەندە بە بۆچوونی من  بوونی حجاب خۆی لە خۆیدا کێشە نیە، چونکە تا ڕادەیەکی زۆر پۆشینی جۆری بەرگ پەیوەندی بە ئازادی تاکەکەسیەوە  هەیە.... بەلام تێگەیشتن و بە ئایدۆلۆژی کردن و بە سیاسی کردنی کێشەیە

 دیارە  بەدرێژایی مێژووی جیهانی ئیسلامی  بەپێی داب و نەریتێکی دینی و کۆمەلایەتی شوێنی ئافرەت – بە شێوەیەکی گشتی – هەر چوار دیواری مالی باوک و مێرد بووە ئەگەر لەو چوار دیوارەش وەدەر بکەوتایە خۆی لە عەبا و پەچەکەی دەئالان...، بۆیە پابەند بوون بە جل و بەرگێک و شێوازێکی تایبەتی گرنگ نەبووە بانگەوازی بۆ بکرێ و کچانی لەسەر  پەروەردە و گۆش بکرێ .. تا ببێتە دیاردە و تێکەل بە سیاسەت و ئایدۆلوجیا بکرێ .

تا لە و کاتەوەی بیر و بۆچوونەکانی خۆرئاوا لە زۆر لە مەیدانەکانی ژیاندا بالی بەسەر ئەم جیهانە پەککەوتەوەدا کێشا  و ئافرەت هاتە مەیدانە جیاوازەکانی کۆمەلگەوە و عەبا و پەچەش بوونە  ڕەمزی کۆنەپەرستی و هۆی ڕێگر لە بەردەم سەردەمی  گۆڕانکاریە خێراکان.... لاساییکردنەوەی خۆر ئاوا لە ڕووی جل و بەرگەوە  لە پێش هەموو دیاردەکانی تری ئەو بیرە پێشکەوتوو خوازە  بە خێرایی پەرەی سەندو بلاو بووە وە .. دیارە ئەوەش لە ئەنجامی کاردانەوەی ئەو بارەی دژوارە  بوو کە کۆمەلگە بەتایبەتی ئافرەتی تێدا بوو و نەبوونی توانای دەرک پێکردنی هۆکارەکان. ڕاستە ئەم لاساییکردنەوە هەر تایبەت نەبوو بە بەرگی ئافرەتەوە بەلام کێشەکە لەوەدا بوو تەنها سەبارەت بە ئافرەت بە گوناهێکی گەورە لەقەلەم درا .

بانگهێشەرانی ((ناسنامەی ئیسلامی ))   ناچار بوون لەبەردەم ئەم واقعەدا هاوسەنگیەک لە نێوان بیری  کۆنەپەرستی کە ئافرەت لە مالەوە توند دەکات و

بیری پێشکەوتنخوازی، دروست بکەن . بۆیە کەوتنە بانگەواز کردن کە ئەوان دژی هاتنە مەیدانی ئافرەت لە کۆمەڵگەدا نین بەمەرجێ باڵا پۆش بن بە پێی مەرجەکانی شەریعەت. دەست کرا بە گۆش کردن و پەروەردەکرنی کچان بە ڕاهێنانیان و ڕازی کردنیان لەسەر پۆشینی جۆرە بەرگێک کە پێ دەوترا ((حجاب)) بە بیانووی ئەوەی کە یەکێکە لەمەرجەکانی ئیمانداری و خوا ڕازی کردن و نیشانەکانی ناسنامەی ئیسلامی و پاراستنی کۆمەڵگە لە فەساد ، دیارە ئەم بۆ چوونە جێی خۆی دەکاتەوە لە کۆمەڵگەیەک کە هەر ڕواڵەتیانە لە شتەکان بڕوانێ و تێ بگات. ئا لێرەوە دەتوانین بڵێین باڵاپۆشی ئافرەت لە دیاردەیەکی کۆمەلایەتیەوە بوە دیاردەیەکی سیاسی.

بە شێوەیەکی گشتی لەبارەی حوکمی حجابەوە دوو ڕەفتاری دژ بەیەکتر هەیە کە هەردووکیان لە یەک بۆچوون و سەیرکردنەوە سەر دەکێشن :
* ئەوانەی ڕەفتاری پێدەکەن پیان وایە کە ئافرەت خوا لە خۆی دەڕەنجێنێ، ئەگەر بێتوو بۆ نموونە قژی لە بەردەم پیاوی بێگانەدا دەرخست (( چونکە لەشی ئافرەت تەنها دەم و چاوی نەبێ عەورەتە واتە نابێ دەرکەوێ )) ..... بۆیە ئەرکێکی دینیە و لەسەریانە ئەو دەقانە پراکتیزێرە بکەن. تەنانەت هەولی ئەوە دەدەن هەموو ئەو ڕەخنانە کە ڕوویان لەم دیاردەیە کردوە پوچەل بکەنەوە و بگەڕێن بە دوای بەلگەدا تا بیسەلمێنن کە نەبوونی باڵاپۆشی دەبێتە هۆی بلاو بوونەوەی فەساد لە کۆمەلگەدا.
* ئەوانەی ڕەفتاری پێناکەن ، دەکرێن بە دوو بەشەوە :
یەکەمیان: هەمان بۆچوونی پێشوویان هەیە و خۆشیان بە گوناهبار دەزانن ،..... بەلام حەزی لێناکەن و پیان ناکرێ ، پییان وایە خوا هەر لێیان خۆش دەبێ ...ئەمانە هەمیشە لە ترسدا دەژین و ناوێرن هیچ پرسیارێک نە لە خۆیان و نە لە چواردەور بکەن. هەر ڕۆژێک بۆیان ڕێک بکەوێ ، ئەوانیش بڕیاری پۆشتەیی دەدەن و خۆیان لەو ترسە ڕزگار دەکەن و سەری خۆیان سووک دەکەن. زۆرن ..

دووەمیان: هەلوێستی دژایەتی و نارەزایی پیشان دەدەن بۆیە ڕفتاری پێناکەن بیانووشیان ئەوەیە کە ئەم تێکستە ڕێگرە لە بەردەم پێشکەوتنی ئافرەت و یەکسانی لەگەل پیاو داو. نەهامەتیەکانی ئافرەت و کۆمەلگە دەدەنە پال ئەم مەسەلەیە. تەنانەت هەندێجار گەشکە دەیانگرێ ئەگەر دیاردەی ((باڵا نەپۆشی)) زۆر ببینن . بە یەکێک لەنیشانەکانی ژیاری و پێشکەوتنی لەقەلەم دەدەن. زۆر کەمن .....

ئەوتێکستانەی کە حوکمی بالا پۆشی ئافرەتیان تێدایە بریتین لە چوار تێکست :

1- **... اذا سالتموهن متاعا فاسئلوهن من وراء الحجاب .... الاحزاب 53**
.... کاتێکیش داوای کەل و پەلێکتان (لە خێزانەکانی پێغەمبەر ) کرد لە پشتی پەردەوە داوایان لێبکەن ....

هۆکاری هاتنەدی ئەم تێکستەدا دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب بە موحەمەد دەلێت (( ئەی پێغەمبەری خوا باش و خراپ دێنە مالەوە بۆ خزمەتت، خۆزگە فەرمانی حجابت بە خێزانەکانت بدایە ..) 12*
حجاب کە لەم تێکستەدا بە مانای جل و بەرگ و پۆشاک نیە بەلکو بە مانای (پەردە) (بەربەست ) دێ و کە پەیوەندی بە مالی پێغەمبەرەوە بووە واتە حوکمی ئەم دەقە ئافرەتان بە گشتی ناگرێتەوە بە دوو بەلگە:
یەکەمیان: ووشەی- حجاب – لە نێوان دووشتدا دەبێ کە بە تەواوی لەیەکیان داپۆشێ. بۆیە لە تێکستەکانی تردا بۆ بالاپۆشی ووشەی (جلباب و خمور ) بەکارهاتووە.
دووەمیان: (هن) کە لە زمانی عەرەبیدا بۆ کۆی مێیینە بەکاردێ بە مانای ( ئەوان ) بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر دەگەڕێتەوە کە لە تێکستی پێشەوەی – الاحزاب - **52** ، **53** باسیان هاتوە. ئەم تێکستانە یاساکان وچۆنیەتی هەلس وکەوت لە مالی پێغەمبەردا دیاری دەکەن. هۆی ئەوەش ئەوە بوو مالی خاوەنی پەیامێکی وەک ئیسلام لەو سەردەمەدا، دیارە مالێکی ئاسایی نیە و زۆر کەس و لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێدەکەن . یەکێک لەو یاسایانە دانانی پەردەیەک بوە لە نێوان خێزانەکانی و خەلکی بیانیدا.
دەکرێ لێرەدا یەکێک بلێ ئەوە نیە لە تەفسیرەکانیشدا هەر وا لێکدراوەتەوە کە ئەم حوکمی( پەردە) تەنها ژنان و کچانی پەیامبەر دەگرێتەوە ...ئیتر چ پێویستمان بە بەلگەیە.
ئەمە ڕاستە بەلام ئەگەر بە ووردی سەیر بکەین دەبینین لە جیهانی ئیسلامیدا لە پراکتایکدا ئەم تەفسیرە باو نیە، تا ئێستەش جیاکردنەوەی ئافرەت و پیاو لە شوێنە گشتیەکاندا و پۆشینی نقاب باوە و بە باشتر سەیردەکرێ

2- ((**یاایها النبي قل لازواجك و بناتك و نساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن ذلك ادنى ان يعرفن فلايؤذين و كان اللة غفورا رحيما**)) الاحزاب **59** (( ئەی پێغەمبەر بە ژنان و کچانی خۆت و ژنانی بڕواداران بلێ :جلک و چارشێوی خۆیان لە خۆیان بپێچن تا بناسرێنەوە و ئازار نەدرێن.)) ووشەی (**جلابيب**) لە عەرەبیدا کۆی (**جلباب**) ە بە بەرگێک دەوترێ لە سەرەوە تا پێ دادەپۆشێ، بۆ مەبەستی چونە دەرەوە دەکرێتە بەر بەسەر جلەکانی تردا.

هۆکاری هاتنەدی  ئەم تێکستە لە ابن کپیردا هاتوە 13* (( لە پێش هاتنەدی ئەم تپکستە  پیاوانی دەروون نەخۆش لە  لەسەر ڕێگەی  ئافرەتاندا لەکاتی چوونە دەرەوەیاندا  دەوەستان و ڕێیان پێدەگرتن بۆ مەبەستی خراپ – ئەوانیش لەدەست ئەو کارە ناشرینە بێزار بوو بون. و ناڕەزاییان دەردەبڕی. بۆیە ئەم تێکست هاتەدی و فەرمانی  دەرکرد ئەو ئافرەتانەی کە بەمە ڕازی نین لە کاتی چوونە دەرەوەیاندا بالای خۆیان بە بەرگێکی زیادە لەسەر بەرگەکەی خۆیانەوە – لە شێوەی عەبا –  بپۆشن تا بناسرێنەوە و ئازار نەدرێن، لە شێوەو ڕووخساردا جیابنەوە لەوانی تر کە خەسلەتی کۆمەلایەتیان کۆیلەیی بووە یان کەنیزەک بوون. 14*

حوکمی  بالا پۆشی لێرەدا گشتیە، بۆ هەمو ئافرەتانە وجلباب دەگرێتەوە واتە بەرگێکی زیادە بەسەر بەرگەکانی تریاندا بۆ مەبەستی چوونە دەرەوە. بەلام تایبەتە بەچارەسەر کردنی گرفتێکەوە مەبەست و پەیامەکەشی  ناسینەوە و جیا بوونەوەی ئافرەتانی موسولمان. لە توێژێک لە ئافرەتان کە لەو کاتەدا پێیان دەوترا کەنیزەک..

**3– والقواعد من النساء  الاتي لا يرجون نكاحا فليس عليهن جناح ان يضعن ثيابهن غير متبرجات  بزينة وان يستعففن خير لهن و الله سميع عليم.**  النور **60**

(( وە ژنانی لە کارکەوتوو کە هیوایان بە شووکردن نەماوە ، گوناهیان بۆ نیە کە جلکی ( سەرەوەی ) خۆیان دابنێن ، بە مەرجێ کە لە ڕاست خەلکیدا ڕازانەووەی خۆیان نیشان نەدەن وە ئەگەر خۆیان داپۆشن بۆیان چاکترە .)) لە تێکستەکەی پێشوودا دەرکەوت بۆ پاراستنی ئافرەتان لە  ئەو ڕێپێگرتن و ئازارەی تووشیان دەهات لە کاتی چوونە دەرەوەیان لە مال، فەرمانیان پێ درا کە  بە بەرگێک پێی دەوترا – جلباب – خۆیان بپۆشن تا بناسرێنەوە

بەلام لەم تێکستەدا  ئەو ئافرەتانەی لێدەرکرا کە لە تەمەنێکدابوون هیوای شووکردنیان نەماوە . چونکە ئەوان پیر بوون و ڕێیان پێنەدەگیرا بۆیە پێویستیان بەو بەرگە زیادەی سەرەوە نەبوو .15*

* دەستەواژەی (( وان يستعففن ))لە (( عفاف )) یان  (( استعفاف))ە وە هاتوە لە تەفسیرەکاندا بە خۆداپۆشین لێکدراوەتەوە  بەلام لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (( خۆ بە دوور گرتن لە هەموو کار و  ووشەیەکی نابەجێ و ناڕەوا))  هیچ بە مانای خۆ داپۆشین نایەت  بەلام دەتوانین بلێین کە لە سەردەمەکانی پێشوودا بالاپۆشین یان خۆ داپۆشین نیشانەیەک بوو بێ بۆ  ( عفە )چونکە هەرسەردەمە و لێکدانەوە و وێنای خۆی لە ڕووی زمانەوانیەوە بۆ دەستەواژەکان هەیە.

**4– (( قل للمؤمنين يغضوا من ابصارهم و يحفظوا فروجهم  ذلك ازكى لهم ))....النور30،**

(( به پیاوانی بڕوادار بلێ : چاوی خۆیان ( لەتەماشاکردنی نامەحرەم ) داخەن و داوێنی خۆیان بپارێزن، ئەمە بۆ ئەوان پاکترە [*]))

(( و**قل للمؤمنات يغضضن من ابصارهن و يحفظن فروجهن** ....

((وە بە ژنانی بڕوادار بلێ: چاوی خۆیان ( لە تەماشای بە حەرامی بگرن ) و داوێنی خۆیان بپارێزێن )) ...

ئەوەی لەم تێکستەدا بەدی دەکرێ سێ حوکمە:

* حوکمی چاو داخستن . بەلام دیارە ئەوە ناگەیەنێ کە پیاو و ئافرەت سەیری یەکتر نەکەن یەکتر نەبینن. بەلگەشمان ئەوەیە یەکەم: - **يغضوا من ابصارهم**- ووشەی - من - لە زمانی عەرەبیدا بۆ - **تبعيض** - بەکاردێ - واتە هەندێ جار ئەگەر مەبەستی هەموو حالەتێک بوایە، دەیفەرموو -**يغضوا ابصارهم** -

دووەم: لەبەر ئەوەی لە هەردوو تێکستەکەدا حوکمی چاو داخستنەکە نە بە ئافرەت نە بە پیاو دیاری نەکراوە

واتە نەیووتوە ئەی پیاوان چاو داخەن لە ئاستی ئافرەتاندا یان بەپێچەوانەوە ... بەلکو دەلێ چاو داخەن لە ئاستی تەماشاکردنی حەرام .ئەوە دەگەیەنێ چاو داخستنەکە هەموو ناڕەوا و حەرامێک بە گشتی دەگرێتەوە یان هەندێ حالەت دەگرێتەوە کە چ پیاو چ ژن حەز ناکەن هیچ کەس بیانبینێ بۆ نموونە لە کاتی خۆ گۆڕیندا کە مرۆڤ پێی خۆش نیە تەنانەت ڕەگەزەکەی خۆشی بیبینێ ....

*پاراستنی داوێن، ئەوەش ڕەفتارێکی کۆمەلایەتیە کە هەموو دین و فەلسەفەیەکی مرۆڤایەتی، بانگەوازی بۆ دەکات و ئافرەت و پیاو وەک یەک لێپرسراوون ....

(( ئەمە تەواو پێچەوانەی ئەو ڕاستیەیە چەندەها سالە کە هەر ئافرەت لەسەر شەرەف دەکوژرێ و مەلا و فتوادەرانیش لە دژی ئەو دیاردەیە فزەیان لێوە نایەت ))

دوای ئەوە دیسانەوە ڕوودەکاتەوە ئافرەتان و داوایان لێدەکات کە ((و جوانی خۆیان بێجگە لەو ئەندازەی وا دیارە (وەکو دەم وچاو و دەستیان تا موچیان ) دەرنەخەن و ( گۆشەی ) لەچکەکانیان بدەن بەسەر سنگیان دا ( تا گەردن و سنگیان داپۆشرێ ) و جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ مێردەکەنیان یان باوکیان نەبێ، بەلکو سەرفراز بن))

**ولا يبدين زينتهن الا ما ظهر منها وليضربن بخمورهن على جيوبهن و لايبدين زينتهن الا لبعلتهن او ابائهن او ... لعلكم تفلحون )) النور 31 ...**

* دەرنەخستنی جوانی. ئەمەیان تایبەتە بە ئافرەت ....

لە سەرەتادا بۆ ئەوەی لە ئەو دەستەواژانەی کە ئەم حوکمەی لە خۆ گرتووە بە ووردی تێبگەین !! دەبێ بگەڕێیینەوە بۆ کۆنتێکستەکەی. هۆکاری هاتنە دی ... کە لە تەفسیری منار دا هاتووە:
(( ..... ئافرەتان لەو ڕۆژگارەدا ((خمار)) یان دەدا بە سەریاندا و کە گۆشەکانیان لە پشت سەریانەوە شۆڕ دەبوە و سنگ و مل و گوێکانیان هەر بەدەرەوە بوون . قورئان فەرمانی پێدان کە ئەوەی کە سەریان پێ داپۆشیوە بیدەن بەسەر سنگیاندا . – موفسر– ەکە ئەلێ (( مەبەستەکە لێرەدا ئەوەیە کە ژنان بە ئەو – خمار– ەی کە بەسەریانەوەیە درزی جلەکانیان یان سنگیان داپۆشن .
هۆیەکی تر ئەوە بوو کە اسماء کچی مرتد لە شوێنی خۆی ئافرەتانی زۆر هاتووچۆیان دەکرد، لای ئەو دەرکەوتنی سنگ و بەرۆک و خلخالی پێ، ناپەسەند بوو)) 16*
ئەم حوکمەیان لەم دەستەواژانەدا دەردەکەون:
* (**لا يبدين زينتهن الا ما ظهر منها**) جوانی خۆیان دەرنەخەن ... بێجگە لەو ئەندازە (جوان )یەی کە خۆی دیارە.
کەواتە جوانیەک کە شاراوە نەبێ دەرخستنی ڕێی پێدەدرێ . ئەوەی ئەم ئەنجامە دەدات بەدەستەوە دوو دەستەواژەیە یەکەم : ووشەی – **يبدى**– لە زمانی عەرەبیدا (( دەرخستنی شتێکە کە خۆی شاراوەیە )) ئەوە دەگەیەنێ کە جوانی ئەندازەی جیاوازی هەیە، هەندێ لەو ئەندازەیە ئاشکرایە و هەندێکی تر شاراوەیە ؟؟
دووەم : دەستەواژەی –**الا ما ظهر منها** – یە ئەوەی خۆی ئاشکرایە ڕێی پێدراوە و ئەوەی شاراوەیە ڕێی پێنەدراوە. لە لێکدانەوەی ئەم دەستەواژە (ڕوون نەکراوەیەدا) بۆچوونی جیاواز لە تەفسیرەکاندا هەیە، بەهێزترینیان (( دەم و چاو و دەست )) ە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەو کەلتوورەدا ئافرەتانی هەندێ لە هۆزە عەرەبەکان دەم و چاو دەستیان بەدەرەوە بوە. بەلام هەندێ جار زیادەڕەوی لەو نەریتەدا کراوە .
* بەچی داپپۆشن؟ (**وليضربن بخمورهن**) ( **خمار** ) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای داپۆشەر دێت. کە سەر یان هەر شتێکی تر پێی داپۆشرێ . **وليضربن بخمورهن على جيوبهن** بەکارهێنانی تێکستەکە لە ووشەی (( **بخمورهن** ))لە بری (( **بالخمور**)) دا دەردەکەوێت کە پێش ئیسلامیش بە پێی ئەو کەلتوورە ئافرەتان هەر پابەند بوون بە سەرپۆشەوە. بەلام گۆڕانکاریەکە لەوەدایە کە بەو داپۆشەرە ((**خمورهن** )).....کە بەسەریانەوەیە –**جيوب**– یان داپۆشن...

ووشەی (**جيب**) لە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای درز دێت ، کە دوو بابەت دەگرێتەوە: درزێک کە لە جلو بەرگدا هەیە و شوێنێکی هەستیاری لەشی لێوەی

دیار دەبێ یان ئەو جێگایانەی لەش کە درزی تێدایە کە سنگ و بن هەنگل بنڕان یەکێکن لەو ئەندامانە .

ئەگەر بە ووردی و دوور لە کاریگەری ئایدۆلۆژیا سەرنجی ئەوتێکستانە بدەین دەگەینە دەر ئەنجامێک کە خمار ((سەرپۆش )) هاوردە و داهێنراوی قورئان نیە بەلکو لە کەلتووری عەرەبدا هەر باو و نەریت بوە...بەلام قورئان بۆ مەبەستێکی تایبەت بەکاری هێنا.

حوکمی بالا پۆشی لە قورئاندا بەم شێوەیە لای خوارەوە دێت:

* لە تێکستی یەکەم (الاحزاب **53**) زیاتر مەبەست لە بوونی پەردەیەک بوو ئەویش لە نێوان خەلک و خێزانی پەیامبەر. هۆکەشی داواکەی عومەری کوڕی خەتتاب بوو، کە بینی مالی پەیامبەر خەلکی بیانی زۆر هاتوو چۆی دەکەن، ئەو پێی باش بوو، کە سنورێک دانرێ بۆ تێکەل بوونیان بەو خەلکانە.

* تێکستی دووەم لاحزاب **59 و** فەرماندان بوو بە خێزانەکانی پەیامبەر و ئافرەتی موسولمانان بە گشتی کە لە کاتی چونە دەرەوەیان بەرگێکی تایبەتی( جلباب) بەسەر جلەکانیاندا بپۆشن. هۆکارەکەشی **ذلك ادنى ان يعرفن فلايؤذين**. واتە بناسرێنەوە و وەک کەنیزەک هەلسوکەوتیان لەگەل نەکرێ .

* تێکستی**سێهەم** النور**60** ڕێگە دان بوو بە ئافرەتانی بە سالاچوو بە لابردنی ئەو بەرگە تایبەتە لە کاتی چوونە دەرەوەیاندا بەکاریان دەهێنا. چونکە ئەو بەرگە کە مۆلەتی پێدراوە لا ببرێ –**ان يضعن ثيابهن– هەر**دەبێ بەرگی سەرەوە بێ.

* لە تێکستی چوارەمدا **النور 31** فەرمان دەدات بە ئافرەتان بە گشتی بە پۆشینی، سنگ و بەرۆک ولەش هەمووی بە هۆی ئەو خمارە وە کە خۆیان بە سەریانەوە بوە و بەپشتیاندا شۆڕدەبوە . هۆکارەکەشی ئەوە بو هەندێ کەس ڕەخنەیان هەبوو لەو شێوەی خۆپۆشینە. یەکێک لەوانە ئافرەت بو ناویشی اسماء کچی مرتد.

گۆڕانکاری و چۆنیەتی هەلس وکەوت کردن لەگەل هەموو بارێکی تازەدا لە کۆمەلگەدا، کاتی زۆر دەوێ و ئاسان نیە. بە هاتنی ئیسلام، کۆمەلیک گۆڕان لە کۆمەلگەی عەرەبیدا ڕوویدا، لەوانە گەورەبوونی ڕۆل و بەشداری کردنی ئافرەت لە ئەرکە کۆمەلایەتیەکان و زیاتر دەرکەوتنی لە شوێنە گشتیەکاندا ( بە پێچەوانەی سەردەمەکانی دواتر) بوو ، بۆیە پێویستیان بە هەندێ ئەحکام هەبووە کە ئەو کۆمەلگەیە لەسەر ئەو بار و دۆخە تازەیە ڕابهێنن . لە هەمانکاتیشدا ئافرەت ڕێزی لێ بگیرێ و وەک مرۆڤ سەیکرێ نەک وەک بابەتێک بۆ جوانی و ڕابواردن بەکار بێ.. بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە، تەنها وەسیلەیەک کە لەو کاتەدا لەبەر دەستتدا بێت بانگەوازکردن. بووە بۆ ئەو دوو یاسا کۆمەلایەتیە ی کە پێشتر باسکرا . یەکەمیان ڕاهێنانی پیاو و ژن لەسەر چاو داخستن لە هەندێ کات و شوێن دا،

دووەمیان شاردنەوەی  جوانی ڕەگەزی مێینە بۆ ئەو کاتەی کۆمەلگەی عەرەب. ئەمەش مەسەلەیەکی هەستیار بووە و پێویست بووە گرنگی پێ بدرێ. هەروەها بار ودۆخی  کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و ئاوو هەوای  ئەو کاتەی ئەو کۆمەلگەیە ڕۆلی هەبوە لەم حوکمەدا  ئەویش پەیوەندی هەیە بەو ڕاستیەی کە ئافرەت لە هەموو کات و  کۆمەلگەیەکدا تا ئێستەش بابەتێکی هەستیارە، مەبەستم لەوەیە تا ئێستەش پیاوان، ژن بەشەرەفی خۆیان دادەنێن و  لەبەر ئەوە  بۆ ئەوان بارسوکیە کە ئەگەر لە چوارچێوەی  مالەوەدا گیریان دەن یان لە ژێر  بەرگدا بیان شارنەوە بە تایبەتی کاتێ بە ناوی  خواوە  بێ جاری واش هەیە گرنگ نیە خۆیان تا چەند پابەندن بەو فەزیلەتانەی کە  خوا داوایان لێدەکات.

لێرەوە دەگەینە ئەنجامێک کە لە کەلتووری قەبیلە عەرەبیەکاندا  ئافرەت دوو شێوە جل و  بەرگی پۆشیوە: یەکەمیان تەنها چاوی بەدەرەوە بووە .– هەندێ دەلێن یەک چاو –.کە (( نقاب))پێ دەوترێ.  دوەمیان سەری داپۆشیوە بەلام  مل و سنگ و بەرۆکی دانەپۆشراوە پێی دەوترێ ((خمار)). قورئان ناوەندی هەردووکیانی  هەلبژاردوە کە دەموچاو دانەپۆشرێ و  و سنگ و بەرۆک بەرەلا نەکرێ . بەلام سەبارەت بە داپۆشینی  سەر یان قژ لێی بێ دەنگ بووە .... جێی هێشتوە بۆ کەلتور  و هەل و مەرجە گۆڕاوەکانی ڕۆژگار.
کەواتە ئەو ئافرەتەی  نیقاب بکات ئەوە سەرپێچی ئەو تێکستەی کردوە  بەلکو کەلتووری جێ بەجێ کردوە. ئەوەشی سەری داپۆشێ کارێکی کردوە کە قورئان لێی بێدەنگ بووە، چونکە دیاردەیەک بوە و باو بوە، دیسانەوە قورئان وەک وەسیلەیەک بەکاریهێناوەتەوە بۆ مەبەستی پۆشینی سنگ و بەرۆک ....

کەواتە حجاب بۆ مالی پێغەمبەر  و جلباب و خمار  بۆ ئافرەتان بەگشتی ئامڕازێک بوون بۆ وەدەستهێنانی ئەو پەیامە کە ئەویش ( ڕێزگرتن بووە لە ئافرەت وەک مرۆڤ نەک وە بابەتی سێکس ))، ،. بە مانایەکی تر ئەرکێکی کۆمەلایەتی بووە بۆ چارەسەرکردنی گرفتێک لە کاتی خۆیدا، نیشانەیەک بوە بۆ جیاکردنەوەی ئافرەتی **–حرة– لە –**امة – . نەک ئەرکێکی دینی بێ و پەیوەندی بە عەقیدە و ئیمانی بەهێز و بێهیزەوە بێ .

ئەگەر  بەلگەی بانگەوازانی دیاردەی بالاپۆشی  مەسەلەی جنس و نەزەری حەرام و وروژاندنی حەزی پیاو  بێت، ئەوا ڕووبەڕوی چەند  پرسیارێک دەبینەوە:
* ئایا بەرز بوونەوەی ڕادەی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی پیاو ڕۆلیان نیە لە سەیرکردنی پیاو بۆ ئافرەت ؟؟
* ئایا بەرز بوونەوەی ڕادەی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی ئافرەت  خۆی ڕۆلی نیە لە سەیرکردنی پیاو بۆ ئافرەت ؟؟

* ئایا بۆ ئافرەتانی کۆیلە  بالاپۆشی بۆ لەسەری فەرز نەبوو ؟ئەوانیش هەر ئافرەت نەبون و  جوان نەبوون

* ئایا  ناتوانین زانستیانە هەردوو ڕەگەزەکە  لە منالیەوە  وا پەروەردە بکەین کە  ڕێز لەیەکتر بگرن  و بە  ویژدانێکی  زیندوە وە هەلس کەوت لەگەل یەکدا بکەن. یان ئەمە کارێکی قورسە ؟؟ ، شاردنەوە و داپۆشینی ئافرەت کارێکی  ئاسانە و  بیرکردنەوەی زۆری ناوێ.

* ئایا هەر  ئافرەت دەبێتە جێی نەزەری حەرام. ئایا هەژانی دەروونی یەکتر بە هۆی خۆ هەلکێشان بە جوانی سەیارە    وئالتوون و مال و خانوو بەرەی بەرز و جل و بەرگی سەرنج ڕاکێش کە ئەمڕۆ نەخۆشیەکی کۆمەلایەتییە  ئافرەت و پیاوی گرتۆتەوە ، حەرام و زەرەرمەند نین ........... ؟؟

* ئایا لە ناو ئەو کۆمەلگایانەی کە ئافرەت بالاپۆشن  زینا ڕوو نادات ؟؟

* ئایا ئەگەر بمانەوێ  کێشەی نەزەری حەرام لە ئافرەت هەر بە هۆی ( خمار و جلباب ) چارەسەر بکەین... دژ  ئەو قاعیدەیە نابینەوە کە دەلێ ( کل ممنوع مرغوب ) . هەرشتێ زۆر بشاررێتەوە زیاتر مرۆڤ  عەودالی دەبێ و هەولی بۆ دەدا.

* ئەو کۆمەلگایانەی کە (خمار یان جلباب ) واز لێهناوە یان هەر نایناسن . چۆن ئەمڕۆ  ( ژیار )  بنیات دەنێن و و چۆن  بوونەتە سەرچاوەی فەلسەفە و زانست و بیری تازەی مرۆڤایەتی .

* کەواتە ئافرەت لە کاتی نوێژدا ( خمار  و جلباب ) ی بۆچیە؟؟

* لەمزگەوتتدا لە نێوان ئافرەت و پیاو دا  پەردە گێڕانەوە !! بۆچی ؟؟ کە ئەوان لەدەرەوەی مزگەوتتدا یەکتردەبینن و   ئەوتێکستەی کە باسی ( پەردە ) دەکات پەیوەندی تەنها بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە هەبووە. هەروەها ئافرەت بە ((بالاپۆشی)) هاتووچۆی مزگەوت دەکات.

هەولی من لە باسەدا  ئەوە نیە کە ئافرەتان  بالاپۆش بن یان نەبن سەرپۆش بکەن یان نەیکەن، چونکە ئازادی کەسێتی لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە  بەلکو پەیام و مەبەستم لە چەند  خالێکدا ڕوون دەکەمەوە کە ئەمانەن:

* هەولێکە بۆ هێنانە کایەی دیالۆک و ڕای جیاواز لەم چەمکەدا  وەک هەموو بابەتەکانی تری ( فقه ) و( شریعە). چونکە تێگەیشتن  و – قاییل بوونێکی مەعریفیانە– لە هەموو کارێکدا پێوویستە

* هەولێکە بۆ چارە کردنی ئەو قەیرانەی کە دژایەتی دروست دەکات لە نێوان بانگهێشت  بۆ ئازادی و دیموکراسی و  فەرزکردنی ئەو (حجابەی)!! ئەمڕۆ باوە .

* هەولێکە بۆ ڕەوینەوەی  پەیوەندی نێوان چەمکی بالاپۆشی و بەرزی و نزمی ڕادەی ئیمان و  لە خواترسی و ڕێگەی ڕاست و چەوت. و نەبەستنەوەی بە  پاداشت

و سزاو و بەهەشت و دۆزەخەوە. و ڕزگار کردنی لەو هەموو هەڕەشەو گورەشانەی کە بە هۆی کەلتووری پیاوکسالاریەوە لێی ئالاوون. بەلگەش ئەوەیە هەروەک لە پێشەوەش بینیمان ئەو تێکستانەی کە پەیوەندی بە (بالاپۆشی )ەوە هەیە هیچ نیشانەیەکی سزادان و هەڕەشی تێدا نیە. بە (( **لعلکم تفلحون**)) **النور31** واتە (( بەلکو سەرفراز بن)) تێکستەکە کۆتایی دێت. مەبەست لەوەیە (( .... بە ئافرەتان بلێ چاوی خۆیان لە سەیرکردنی حەرام داخەن و داوێنی خۆیان بە پاکی بپارێزن ئەو جوانیەیان کە شاراوەیە دەری نەخەن و تەنها ئەو ئەندازە نەبێ کە بەدەرەوەیە و بە داپۆشەرەکەی سەریان سنگ و بەرۆکیان داپۆشن... بەلکو سەرفراز بن ))

بە پێچەوانەی زۆر لە تێکستی تر کە زۆر هەڕەشەی سەخت و توندی تێدایە. بۆ نموونە ئەو تێکستەی کە چارەنوسی ئەو کەسانەی هەر خەریکی کۆکردنەوەی زێڕ زیون و نایبەخشن، باس دەکات و بە سزای سەخت و بە توندی دەیانترسێنێ و ئاگاداریان دەکاتەوە ((... **یوم یحمی علیها في نار جهنم فتکوی بها جباههم و جنوبهم و ظهورهم ..** )) **التوبە35** (( ڕۆژێ کە زێڕ وزیو لە ئاگری جەهەنەمدا سورئەکرێتەوە، ناوچەوان و قەبرغە و پشتیان پێ داغ ئەکرێ ...)) یان لەسزای بەفیڕۆدان و زیادەڕەوی لە خەرجی و بەکارهێناندا ( **اسراف وتبذیر** ) ئەو کەسانە ئەخاتە ڕیزی شەیتانەوە (( ...**ان المبذرین کانوا اخوان الشیاطین**))**الاسراء 27** و باسکردنی کەسانی تر لە پاشملە بە مەبەستی شکاندنیان ( **غیبە** ) ئەیانشوبهێنێ بەو حالەتەی کە یەکێک ئەوەندە دڕندە بێ گۆشتی برای خۆی بە مردوی بخوات ، ((... **ایحب احدکم ان یاکل لحم اخیة میتا...** )) الحجرات 12

ئەمڕۆ تا چ ڕادەیەک ئەم سێ تێکستەی کە پەیوەندیەکی زۆر بەهێزیان بە ویژدان و ڕەوشت و لەخۆبووردن و ویەکسانی و هاوسانی کۆمەلایەتیەوە هەیە و هەرەسهێنان و ڕوخانی کۆمەلگە لەسەرپێچی کردنیاندایە، جێبە جێ دەکرێن.
چەند ئافرەت بە (بالا پۆش و بالانەپۆش) ەوە و چەند پیاو هەن ڕۆژانە پەیامی ئەم تێکستە لە زهنیاندا ئامادە بێ و بیری کەسانی تریشی بخەنەوە و هۆشیارانە و ئازایانە خۆیان و چواردەوریان لەنەخۆشی کۆمەلایەتی پێشبڕکێی زێڕ و زیو و سەیارە و مال و خانووبەرەی بەرز و جل و بەرگ و ماکیاج ،، بپارێزن یان هیچ نەبێ ئەو نەخۆشیە کۆمەلایەتیە کاریان تێنەکات.

* هەولێکە بۆ کەمکردنەوەی ئەو هەمو بەرپرسیارێتی و تاوانانەی کە دەدرێتە پال ئافرەت بە هۆی بالا نەپۆشیەوە بۆ نموونە وەک دەلێن ((ئەگەر ئافرەت سنورەکانی خوای بەزاند ئەوا بە شێوەیەکی ئاسایی کۆمەلگە و خەلکیش بەرەو سنور بەزاندن دەبات )) ئەمە ووتەیەکی کال و کرچ و دوور لە زانیاری کۆمەلناسی و نهێنیەکانیەتی. بەلگەش لێرەدا ئەوەیە :ئایا سونەرەکانی خوا لە مەسەلەیەکی

وا سادە و ڕواڵەتیدا دەبینرێ یان لە کۆمەڵێک بابەتی ئاڵۆز تر و سەخت تر و ترسناکتردا دەبێ باسی لێوە بکرێ ؟ ڕاستە، زیادەڕەوی ئافرەت لە بالانەپۆشیدا هەندێ کێشەی کۆمەلایەتی و ئابوری دروست دەکەن، بەلام ئەگەر ئەو مرۆڤە چۆنیەتی بیرکردنەوە و دل و دەروونی پڕ بوو لە کێشەو ئەزمە جۆر بەجۆرەکان ، پێم نالێی (خمار و جلباب) چی لێدەکات ؟؟ یان ئایا ئەوکێشە کۆمەلایەتیانە هەر بە یەک وەسیلە و ڕێگە چارەسەر دەکرێن یان ڕێگەی تر زۆرن ...سەرەڕای ئەوەش زۆربەی ئەو کێشانە پەیوەندی هەیە بە ناخ ویژدانەوە. بۆ نموونە هیچ پەیوەندیەکی وا بەهێز نیە لە نێوان کێشەی ئابووری و –مۆدە و بالانەپۆشی – خۆ ئەگەر بشمانەوێ ئەوە بسەلمێنین ئەوە پێویستمان بە لێکۆلینەوەی مەیدانی هەیە .

ئەو ئافرەتەی ویژدانی زیندوو بێ و هۆشیار بێ لە ڕووی ئابوریەوە ـ بالاپۆش بێ یان نا– دلی نایە زیادەڕەوی بکات لە خەرجیدا بۆ نموونە بەکارهێنانی کارەبا ..

* هەولێکە بۆ دروستکردنی هاوسەنگیەک لە نێوان ئەو دیدەی کە پێی وایە ئافرەتی –سەرپۆش بەسەر و جلباب لەبەر – هێمایەکە بۆ وێنەی کۆمەلگەیەکی دیندار و ئەو دیدەش کە گۆڕان لە ڕوالەت و ڕوکەش لە بری جەوهەر و ناخ ودەروون دەکاتە پێوەر بۆ خوێندنەوەی کۆمەلگە و هەلسەنگاندنی تاکەکانی و پڕۆسەی گۆڕانکاری. هەروەک نوسەر مەریوان ووریا قانع لە بابەتێکیدا لە ژێر ناونیشانی (سیاسەت و جەستەی ئافرەت) دا دەلێ: ((... ئەم نەوەیە لە ڕۆشنبیران و خوێندەوارانی کورد پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان وێنەی نوێی ئافرەت و وێنەی لە دایکبوونی کۆمەلگایەکی تازەدا دروست دەکەن ...))لە دیدی ئەواندا ئافرەتی تازە هێما یە بۆ وێنەی کۆمەلگایەکی تازە ((... ئەمڕۆ جەستەی ئافرەت جەستەیەکی تەواو سیاسیە، ئافرەتان دەبێ هۆشیار بن لەو گەمە سیاسیانەی بە جەستەیان دەکرێت ))17* هەتا ئافرەتان زیادەڕەوی کردن لە دەرخستنی لەش و لاریاندا بە ئازادی تێ بگەن و خمار و جلباب بە دینداری لەقەلەم بدەن ، هەروا وەک بابەتێکی هەستیار و جێی سەرنج دەمێننەوە و نابنە خاوەنی کەسێتیەکی بەهێز و کاریگەر لە کۆمەلگەدا بەلکو هەر لایەنێ بۆ مەرامی خۆی بەکاری دێنێ .

* هەولێکە بۆ ڕاستکردنەوەی پڕۆسەی پەروەردەکردن ودروستکردنی کەسێتی مندال بە تایبەتی کچان بە ئاراستەی بابەتە جەوهەری بەها مرۆڤایەتیەکان لەبری ڕوالەت و ڕوکەش ....

* ڕزگارکردنی ئافرەتان (( بە تایبەتی کچانی بالانەپۆش)) لەو گرێ کوێرەی دەروونی کە توشیان دێ لەئەنجامی هەستکردنیان بەوەی خوایان ڕازی نەکردوە بەوەی بالاپۆش نەبوون .لە بیریان چووە کە ڕازی بوونی خوا بە کارێکی وا سادە وەدەست نایە.

* هەولێکە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بۆچوونەی کە پەیوەندی دەخاتە نێوان پلانی داگیرکەر و مەسەلەی بالانەپۆشیەوە، مەبەستی من لەمە ئەوە نیە پێچەوانەی ئەو بۆچونە بسەلمێنم. نەخێر بەلکو من هیچ پەیوەندیەک لە نێوان– بالاپۆشی و بالانەپۆشی – و ئارام وئاسایشی وولات و پلانی وولاتە زلهێزەکان نابینم، چونکە هیچ وولاتێک نەبوو بە ڕادەی ئەفغانستان و عێراق بالاپۆش تێدا بلاو بوو بێ، کەچی دەیان سالە ئارام و ئاسایش تیایاندا بەرناگرێ و بەردەوام نابێ و زۆر بە باشیش – هەروەک دەلێن – بوونەتە جێگا و مۆلگەی پلانی وولاتە زلهێزەکان ...!!! زۆر وولاتی کەش هەن بالاپۆشی هەر تێدا نیە و بۆتە جێگە و مۆلگەی هەمان نەخشە و پلان .

سەرە ڕای ئەوەش هۆکار هاتنەدی تێکستی بالاپۆشی وەک پێشتریش بۆمان دەرکەوت هیچ پەیوەندی بەم جۆرە بیانوانەوە نیە بەلکو چارەسەرێک بووە بۆ گرفتێکی کۆمەلایەتی و کەلتووری.

* ڕزگار کردنی ئافرەتانی بالا پۆش لەو خۆشخەیالیەی کە کۆمەلگەیان بە هۆی بالاپۆشیانەوە پاراستوە ڕێگەکانی تر کە خوای پێ ڕازی دەکرێ بیری لێناکەنەوە و بەدوایدا ناگەڕێن ..لە بیریان چوە کە کۆمەلگە بەدەست چەند دەردی ئالتۆز تر و قول ترەوە دەنالێنێ و چەندووریای و دەوێ لە دیاریکردنی فاکتەر و هۆکانی و چارەکردنی ...

* نەهێشتنی ئەو تێکەل کردنە کە دروست بوە لە نێوان ئەو بالاپۆشیەی کە قورئان داوای دەکات و ئەوەی کە لە کەلتووردا باو بوە .

تا ئێستەش لە زۆربەی وولاتانی ئیسلامیدا (( نقاب )) هەرباوە و تەنانەت لە زانکۆ و شارە گەورەکان و لە ئەورووپاشدا، زۆر بە توندیژیش بەرگری لێدەکەن. وەرە با پێکەوە سەرنج لەم تێکستە بدەین:

(( سەبارەت بە مەسەلەی حجاب لە نێوان ئێمە و ئەو زانایانەی کە (( لەگەل نقابدا نین)) هیچ جیاوازیەکمان نیە کە باشتر و تەواو تر و نزیکتر لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەر ئەوەیە کە هەموو لەش داپۆشراو بێ بە دەم و چاو و دەستیشەوە ..)) **18***. پێم نالێی ئەمە لە کوێ وە هاتوە ئەگەر لەو کەلتوورەوە نەبێ کە لە پێش ئیسلامدا دروست بووە . هەرچەند قورئان ڕێگە بەو ئەندازە جوانیە دەدات کەوا خۆی دیار بوە وەک –دەم و چاو دەست – کە نەپۆشرێ دەبینی ئەوان هەر نەریتەکەی خۆیان بە چاکتر دەزانن لەوەی داوایان لێکراوە لەوەش زیاتر ئەوەشی کە دەم و چاوی داناپۆشێ و بە پێی تێکستەکان ئەڕوات بەشێوەیەکی گشتی .هێشتا لەو باوەڕەدان کە ئەگەر بۆیان بکرێ دەبێ نقاب بپۆشن. یان دەبێ داوای نقاب پۆشین بەکەن.

* هەولێکە بۆ هۆشیارکردنەوەی ئافرەتان ئەوەی ڕەفتار بە تێکستەکانی حجاب دەکات ئەوەشی ڕەفتاری پێناکات لە هەبژاردنیان بۆ هەربۆچوونێک و دروستکردنی وژدانێکی زیندوو و چاودێر لە دەروون و ناخی خۆیاندا بەسەر شێوە و ڕووخسار و هەلس وکەوتیان دانێن، نەک لە ئەنجامی ترس و تۆقاندن بەناچاری خۆیان بپێچننەوە_ کە ئەوە کاریگەری خراپی دەبێ لەسەر تواناکانیان .- یان لە ئەنجامی کاردانەوە و ڕق لێبوونەوە ئازادی تەواو بەخۆیان بدەن ببنە هۆی دروست بوونی پێشبرکێ کردن لە دەرخستنی لەش و لاریاندا.

بە بۆچونی ئەگەر ئافرەتان بیانەوەێ لە کۆتی کەلتور ڕزگاریان ببێ و لە هەمانکاتیشدا نەبنە کۆتی ئازادیەکی ناهۆشیارانە و هەروەها نەبنە بابەتی شهوە و جنس پێویستە هەول بدەن چەند مەرجێک لە جل وبەرگیاندا ڕەچاو بکەن:

1- پێشبڕکێ لە نێوان ئافرەتان خۆیاندا دروست نەکات.

2- شوێنی زۆر هەستیاری جەستەی ئافرەت دەرنەخات هیچ نەبێ لەوەدا با وەکو پیاو بن چۆن ڕوویان نایە سنگ و ڕانیان پیشان بدەن.

3 -گونجاندنی جل و بەرگ لەگەل ئەو ڕۆلە مەزنەی کە ئافرەت خۆی لە کۆمەلگەدا شایەنیەتی و داوای دەکات.

4- بەشێوەیەکی وا نەبێ کە زۆرترین کات و نرخی ماددی تێچێ بە مانایەکی تر مۆدە نەبێتە ئەولەویاتیان

5- هەلبژاردنی شێوەی ڕووخسار جل و بەرگ و بە پێی شوێن و جۆری ئیش . بۆ نموونە زیادە ڕەوی لە خۆڕازاندنەوە لە قوتابخانە و زانکۆکاندا گونجاو نیە لەگەل پەیامی فێرکردن و خوێندندا.

6- دوورکەوتنەوە لە چاولێکردنی بێ ئاگایانە...

کۆمەلگە ئیسلامیەکان ئەو هەموو گرنگی و کات و جووهدەی داویانە بە مەسەلەی ((خمار و جلباب )) نیو ئەوەندە گرنگیان بدایە بە مەسەلەی (قات جووین و خەتەنەی کچان)**19*** و ژن بەژن و بە زۆر بەشوودان و جادووگەری و ئیسراف کردن و مەسەلەی شیربایی و مارەیی و ئیدمانی ئافرەتان لەسەر بازاڕ و ماکیاج ، تێ دەگەم ئێستە لە بارێکی زۆر باشتر و گونجاو تردا دەبینرا. جالیەی ئیسلامی لە بری ئەوەی خۆپیشاندان لە دژی یاسای قەدەغە کردنی حجاب لە فەڕەنسا ڕێکخات، دەبوایە خۆپیشاندانی لە دژی هەموو ئەو نەهامەتی و بارە ناهەموارانەی کە کۆمەلگەی ئیسلامی بە گشتی و ئافرەتان بە تایبەتی لە وولاتەکانی خۆیان و بەدەستی حوکمەتەکانی خۆیانەوە بەسەریاندێ ڕێکخستایە.

چارەسەرکردن و باشکردنی باری کۆمەلایەتی ئافرەت لە هەمان کەلتورە وە هەلدەقولێ کە خۆی بوەتە هۆکار لە دروست بوونی ئەو کێشە و بارە کۆمەلایەتیانە..بە ڕوون تر بلێین پیاچوونەوە و گۆڕینی گوتار و فقهی ئیسلامی

کارێکی حەتمیە لەم مەسەلەیەدا بەتایبەتی بۆ ئێمە _ وەک کورد_ لەم سەردەمەدا بۆ ئەوەش پێویستمان بە شکاندنی ئەو دیوارانەیە کە ئایدۆلۆژیای بزاڤە ئیسلامی ونا ئیسلامیەکان لە نێوان ئێمە وخوێندنەوەیەکی بابەتیانە بۆ مێژوو، دروستیان کردووە. 20

*

پەراوێزەکان

---

1*– ڕوونکردنەوەیەک: لە زۆربەی تەفسیرە نوێکاندا، مانای **الیتامی** بە کچانی بێ باوک لێکدراوەتەوە. بەلام لە تەفسیرە کۆنەکاندا، کە سەیری هۆکاری تێکستەکە – سبب النزول– دەکەی دەبینی کە باسی پاراستنی مالی – بێباوکان– بە گشتی دەکات و هەروەها کچانی بێباوک. جگە لەوەش تێکستی پێش ئەم تێکستە هەر پەیوەندی بە پاراستنی مالی –بێباوکان– بە گشتی هەیە. هەر هەمان ووشەی **الیتامی** بەکارهاتوە .

و اتوا اليتامى اموالهم و لا تتبدلوا الخبيث بالطيب و لا تاكلوا اموالهم الى اموالكم انه كان حوبا كبيرا * و ان خفتم الاتقسطوا في اليتامى فانكحوا.... النساء 2، 3

**المجمع** الوسيط

اليتيم ج– ايتام و <u>يتامى</u> و يتائم

اليتيمة ج – <u>يتامى</u> و يتائم

2* حدَّثَنَا هَنَّاد بْن السَّرِيّ ، قَالَ : ثنا أَبُو الْأَحْوَص ، عَنْ سِمَاك ، عَنْ عِكْرِمَة فِي قَوْله : { وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنْ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلَاث وَرُبَاع فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَة أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانكُمْ } قَالَ : كَانَ الرَّجُل يَتَزَوَّج الْأَرْبَع وَالْخَمْس وَالسِّتّ وَالْعَشْر ، فَيَقُول الرَّجُل : مَا يَمْنَعنِي أَنْ أَتَزَوَّج كَمَا تَزَوَّجَ فُلَان ، فَيَأْخُذ مَال يَتِيمه فَيَتَزَوَّج بِهِ ، فَنُهُوا أَنْ يَتَزَوَّجُوا فَوْق الْأَرْبَع . 6743 – حَدَّثَنَا سُفْيَان بْن وَكِيع ، قَالَ : ثنا أَبِي ، عَنْ سُفْيَان ، عَنْ حَبِيب بْن أَبِي ثَابِت عَنْ طَاوُس ، عَنْ اِبْن عَبَّاس ، قَالَ : قُصِرَ الرِّجَال عَلَى أَرْبَع مِنْ أَجْل أَمْوَال الْيَتَامَى

* حَدَّثَنَا الْقَاسِم ، قَالَ : ثنا الْحُسَيْن ، قَالَ : ثني حَجَّاج ، عَنْ اِبْن جُرَيْج ، عَنْ هِشَام ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ عَائِشَة ، قَالَتْ : نَزَلَ ، يَعْنِي قَوْله : { وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى } . .. الْآيَة ، فِي الْيَتِيمَة تَكُون عِنْد الرَّجُل ، وَهِيَ ذَات مَال ، فَلَعَلَّهُ يَنْكِحهَا لِمَالِهَا، وَهِيَ لَا تُعْجِبهُ ، ثُمَّ يَضُرّ بِهَا ، وَيُسِيء صُحْبَتهَا ، فَوُعِظَ فِي ذَلِكَ . قَالَ أَبُو جَعْفَر: فَعَلَى هَذَا التَّأْوِيل جَوَاب قَوْله : { وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا } قَوْله : { فَانْكِحُوا } . وَقَالَ آخَرُونَ : بَلْ مَعْنَى ذَلِكَ : النَّهْي عَنْ نِكَاح مَا فَوْق الْأَرْبَع ، حَذَرًا عَلَى أَمْوَال الْيَتَامَى أَنْ يُتْلِفهَا أَوْلِيَاؤُهُمْ ، وَذَلِكَ أَنَّ قُرَيْشًا ، كَانَ الرَّجُل مِنْهُمْ يَتَزَوَّج الْعَشْر مِنْ النِّسَاء ، وَالْأَكْثَر ، وَالْأَقَلّ ، فَإِذَا صَارَ مُعْدِمًا ، مَالَ عَلَى مَال يَتِيمه الَّذِي فِي حَجْره ، فَأَنْفَقَهُ ، أَوْ تَزَوَّجَ بِهِ ، فَنُهُوا عَنْ ذَلِكَ ؛ وَقِيلَ لَهُمْ : إِنْ أَنْتُمْ خِفْتُمْ عَلَى أَمْوَال أَيْتَامكُمْ أَنْ تُنْفِقُوهَا ، فَلَا تَعْدِلُوا فِيهَا مِنْ أَجْل حَاجَتكُمْ إِلَيْهَا ، لِمَا يَلْزَمكُمْ مِنْ مُؤَن نِسَائِكُمْ ، فَلَا تُجَاوِزُوا فِيمَا تَنْكِحُونَ مِنْ عَدَد النِّسَاء عَلَى أَرْبَع ، وَإِنْ خِفْتُمْ أَيْضًا مِنْ الْأَرْبَع أَلَّا

تَعْدِلُوا فِي أَمْوَالهمْ فَاقْتَصِرُوا عَلَى الْوَاحِدَة ، أَوْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانكُمْ. ذِكْر مَنْ قَالَ ذَلِكَ :
6742 – حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْن الْمُثَنَّى ، قَالَ : ثنا مُحَمَّد بْن جَعْفَر ، قَالَ : ثنا شُعْبَة ، عَنْ سِمَاك ، قَالَ : سَمِعْت عِكْرِمَة يَقُول فِي هَذِهِ الْآيَة : { وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى } قَالَ : كَانَ الرَّجُل مِنْ قُرَيْش يَكُون عِنْده النِّسْوَة ، وَيَكُون عِنْده الْأَيْتَام ، فَيَذْهَب مَاله ، فَيَمِيل عَلَى مَال الْأَيْتَام. قَالَ : فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَة : { وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنْ النِّسَاء } .

وَقَوْله " وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنْ النِّسَاء مَثْنَى أَيْ إِذَا كَانَ تَحْت حِجْر أَحَدكُمْ يَتِيمَة وَخَافَ أَنْ لَا يُعْطِيهَا مَهْر مِثْلهَا فَلْيَعْدِلْ إِلَى مَا سِوَاهَا مِنْ النِّسَاء فَإِنَّهُنَّ كَثِير وَلَمْ يُضَيِّق اللَّه عَلَيْهِ. وَقَالَ الْبُخَارِيّ : حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيم بْن مُوسَى حَدَّثَنَا هِشَام عَنْ اِبْن جُرَيْج أَخْبَرَنِي هِشَام بْن عُرْوَة عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَة : أَنَّ رَجُلًا كَانَتْ لَهُ يَتِيمَة فَنَكَحَهَا وَكَانَ لَهَا عِذْق وَكَانَ يُمْسِكهَا عَلَيْهِ وَلَمْ يَكُنْ لَهَا مِنْ نَفْسه شَيْء فَنَزَلَتْ فِيهِ " وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا " أَحْسَبهُ قَالَ : كَانَتْ شَرِيكَته فِي ذَلِكَ الْعِذْق وَفِي مَاله .

النساء 3 تفاسير الطبري و ابن كثير و القرطبي

3* ڕوونکردنەوەیەک:

ئەو تەفسیرەی کە باوە ئەم ئایەتە، ئەوەیە کە ئەگەر پیاوێک مەیلی بۆ یەکێک لە ژنەکانی نەما، دەبێ خۆی چاک بکات... دیارە ئەمەش هەر دیسانەوە ئەوە ئەگەیەنێ کە هەتا بکرێ نابێ جیابونەوە چارەسەر بێ . بەلام بە بۆچونی من دیسان بەم تەفسیرەش ژنان زەرمەند بوون. خۆگۆڕین بۆ ئەوەی کەسێکت خۆش بوێ کارێکی گرانە. بۆیە من وای بۆ دەچم کە ئەگەر جارێکی ئەم ئایەتە تەفسیر بکرێتەوە پێویستە (( ووشەی ان تصلحوا * زیاتر و فراوانتر لێکبدرێتەوە و یەکێ لەو چارانە جیابونەوە بێ ( تەلاق).

خۆ تەلاقیش جۆرێکە لە چاککاری هەرچەن چاکاریەکی ناچاریە.

ان ابغض الحلال عند الطلاق

4* – فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُل وَامْرَأَتَانِ " وَهَذَا إِنَّمَا يَكُون فِي الْأَمْوَال وَمَا يَقْصِد بِهِ الْمَال.

الظَّاهِر مِنْهُ قَوْل الْجُمْهُور ، أَيْ إِنْ لَمْ يَكُنْ الْمُسْتَشْهَد رَجُلَيْنِ ، أَيْ إِنْ أَغْفَلَ ذَلِكَ صَاحِب الْحَقّ أَوْ قَصَدَهُ لِعُذْرٍ مَا فَلْيَسْتَشْهِدْ رَجُلًا وَامْرَأَتَيْنِ . فَجَعَلَ تَعَالَى شَهَادَة الْمَرْأَتَيْنِ مَعَ الرَّجُل جَائِزَة مَعَ وُجُود الرَّجُلَيْنِ فِي هَذِهِ الْآيَة ، وَلَمْ يَذْكُرهَا فِي غَيْرهَا ، فَأُجِيزَتْ فِي الْأَمْوَال خَاصَّة فِي قَوْل الْجُمْهُور ، بِشَرْطِ أَنْ يَكُون مَعَهُمَا رَجُل . وَإِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ فِي الْأَمْوَال دُون غَيْرهَا ؛ لِأَنَّ الْأَمْوَال كَثَّرَ اللَّه أَسْبَاب تَوْثِيقهَا لِكَثْرَةِ جِهَات تَحْصِيلهَا وَعُمُوم الْبَلْوَى بِهَا وَتَكَرُّرهَا ، فَجَعَلَ فِيهَا التَّوَثُّق تَارَة بِالْكَتْبَةِ وَتَارَة بِالْإِشْهَادِ وَتَارَة بِالرَّهْنِ وَتَارَة بِالضَّمَانِ ، وَأَدْخَلَ فِي جَمِيع ذَلِكَ شَهَادَة النِّسَاء مَعَ الرِّجَال . وَلَا يَتَوَهَّم عَاقِل أَنَّ قَوْله تَعَالَى : " إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ " يَشْتَمِل عَلَى دَيْن الْمَهْر مَعَ الْبُضْع ، وَعَلَى الصُّلْح عَلَى دَم الْعَمْد ، فَإِنَّ تِلْكَ الشَّهَادَة لَيْسَتْ شَهَادَة عَلَى الدَّيْن ، بَلْ هِيَ شَهَادَة عَلَى النِّكَاح . وَأَجَازَ الْعُلَمَاء شَهَادَتهنَّ مُنْفَرِدَات فِيمَا لَا يَطَّلِع عَلَيْهِ غَيْرهنَّ لِلضَّرُورَةِ . وَعَلَى مِثْل ذَلِكَ أُجِيزَتْ شَهَادَة الصِّبْيَان فِي الْجِرَاح فِيمَا بَيْنهمْ لِلضَّرُورَةِ

البقرة 282 القرطبي ابن كثير

5*-  وَقَالَ سُفْيَان بْن عُيَيْنَة عَنْ الزُّهْرِيّ عَنْ عَبْد اللَّه بْن عَبْد اللَّه بْن عُمَر عَنْ إِيَاس بْن عَبْد اللَّه بْن أَبِي ذِئَاب قَالَ : قَالَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " لَا تَضْرِبُوا إِمَاء اللَّه " فَجَاءَ عُمَر رَضِيَ اللَّه عَنْهُ إِلَى رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ ذَئِرَتْ النِّسَاء عَلَى أَزْوَاجهنَّ فَرَخَّصَ رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ضَرْبهنَّ فَأَطَافَ بِآلِ رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاء كَثِير يَشْتَكِينَ أَزْوَاجهنَّ فَقَالَ رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " لَقَدْ أَطَافَ بِآلِ مُحَمَّد نِسَاء كَثِير يَشْتَكِينَ مِنْ أَزْوَاجهنَّ لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ "

..... وَقَوْله تَعَالَى " فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا " أَيْ إِذَا أَطَاعَتْ الْمَرْأَة زَوْجهَا فِي جَمِيع مَا يُرِيدهُ مِنْهَا مِمَّا أَبَاحَهُ اللَّه لَهُ مِنْهَا فَلَا سَبِيل لَهُ عَلَيْهَا بَعْد ذَلِكَ وَلَيْسَ لَهُ ضَرْبهَا وَلَا هِجْرَانهَا ، وَقَوْله إِنَّ اللَّه كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا تَهْدِيد لِلرِّجَالِ إِذَا بَغَوْا عَلَى النِّسَاء مِنْ غَيْر سَبَب فَإِنَّ اللَّه الْعَلِيّ الْكَبِير وَلِيّهنَّ وَهُوَ مُنْتَقِم مِمَّنْ ظَلَمَهُنَّ وَبَغَى عَلَيْهِنَّ

ابن كثير

6 *

النساء 1 يايهاالناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة...

النحل 97 من عمل صالحا من ذكر او انثى و هو مؤمن فلنحيينه حياة طيبة و لنجزينهم اجرهم باحسن ما كانوا يعملون*

غافر 40 من عمل سيئة فلا يجزى الا مثلها و من عمل صالحا من ذكر او انثى و هو مؤمن فاولئك يدخلون الجنة...*

7*- جَاءَتْ اِمْرَأَة سَعْد بْن الرَّبِيع إِلَى رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ : يَا رَسُول اللَّه هَاتَانِ اِبْنَتَا سَعْد بْن الرَّبِيع قُتِلَ أَبُوهُمَا مَعَك فِي يَوْم أُحُد شَهِيدًا وَإِنَّ عَمّهمَا أَخَذَ مَالهمَا فَلَمْ يَدَع لَهُمَا مَالًا وَلَا يُنْكَحَانِ إِلَّا وَلَهُمَا مَال قَالَ : فَقَالَ " يَقْضِي اللَّه فِي ذَلِكَ " فَنَزَلَتْ آيَة الْمِيرَاث فَأَرْسَلَ رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى عَمّهمَا فَقَالَ : " أَعْطِ اِبْنَتَيْ سَعْد الثُّلُثَيْنِ وَأُمّهمَا الثُّمُن وَمَا بَقِيَ فَهُوَ لَك.

8*- فَإِنَّ أَهْل الْجَاهِلِيَّة كَانُوا يَجْعَلُونَ جَمِيع الْمِيرَاث لِلذُّكُورِ دُون الْإِنَاث فَأَمَرَ اللَّه تَعَالَى بِالتَّسْوِيَةِ بَيْنهمْ فِي أَصْل الْمِيرَاث وَفَاوَتَ بَيْن الصِّنْفَيْنِ فَجَعَلَ لِلذَّكَرِ مِثْل حَظّ الْأُنْثَيَيْنِ وَذَلِكَ لِاحْتِيَاجِ الرَّجُل إِلَى مُؤْنَة النَّفَقَة وَالْكُلْفَة وَمُعَانَاة التِّجَارَة وَالتَّكَسُّب وَتَحَمُّل الْمَشَاقّ فَنَاسَبَ أَنْ يُعْطَى ضِعْفَيْ مَا تَأْخُذهُ الْأُنْثَى .

ابن كثير

9*-  قَالَ الْإِمَام أَحْمَد حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيل وَمُحَمَّد بْن جَعْفَر قَالَا : حَدَّثَنَا مَعْمَر عَنْ الزُّهْرِيّ قَالَ اِبْن جَعْفَر فِي حَدِيثه ، أَنْبَأَنَا اِبْن شِهَاب عَنْ سَالِم عَنْ أَبِيهِ أَنَّ غَيْلَان بْن سَلَمَة الثَّقَفِيّ أَسْلَمَ وَتَحْته عَشْر نِسْوَة فَقَالَ لَهُ النَّبِيّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " اِخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا " فَلَمَّا كَانَ فِي عَهْد عُمَر طَلَّقَ نِسَاءَهُ وَقَسَمَ مَاله بَيْن بَنِيهِ فَبَلَغَ ذَلِكَ عُمَر فَقَالَ : إِنِّي لَأَظُنّ الشَّيْطَان فِيمَا يَسْتَرِق مِنْ السَّمْع سَمِعَ بِمَوْتِك فَقَذَفَهُ فِي نَفْسك وَلَعَلَّك لَا تَلْبَث إِلَّا قَلِيلًا وَأَيْم اللَّه لَتُرَاجِعَنَّ نِسَاءَك وَلَتَرْجِعَنَّ مَالك أَوْ لَأُوَرِّثُهُنَّ مِنْك وَلَآمُرَنَّ فَيُرْجَم بِقَبْرِك كَمَا رُجِمَ قَبْر أَبِي رِغَالٍ

**تفســــــير ابــن كثـــير**

10*– وَإِنَّمَا ذَلِكَ أَنَّهُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّة كَانَتْ إِحْدَاهُنَّ إِذَا مَاتَ زَوْجهَا كَانَ اِبْنه أَوْ قَرِيبه أَوْلَى بِهَا مِنْ غَيْره وَمِنْهَا بِنَفْسِهَا ، إِنْ شَاءَ نَكَحَهَا وَإِنْ شَاءَ عَضَلَهَا فَمَنَعَهَا مِنْ غَيْره وَلَمْ يُزَوِّجهَا حَتَّى تَمُوت

الطبري

11*– قَالَ الْإِمَام أَحْمَد : حَدَّثَنَا عَبْد الرَّحْمَن بْن مَهْدِيّ حَدَّثَنَا حَمَّاد بْن سَلَمَة عَنْ ثَابِت عَنْ أَنَس أَنَّ الْيَهُود كَانَتْ إِذَا حَاضَتْ الْمَرْأَةُ مِنْهُمْ لَمْ يُوَاكِلُوهَا وَلَمْ يُجَامِعُوهَا فِي الْبُيُوت فَسَأَلَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ – صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ " وَيَسْأَلُونَك عَنْ الْمَحِيض قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاء فِي الْمَحِيض وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ " حَتَّى فَرَغَ مِنْ الْآيَة . فَقَالَ رَسُول اللَّه – صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – " اِصْنَعُوا كُلّ شَيْء إِلَّا النِّكَاح "(( يعني الجماع )) فَبَلَغَ ذَلِكَ الْيَهُود فَقَالُوا : مَا يُرِيد هَذَا الرَّجُل أَنْ يَدَع مِنْ أَمْرنَا شَيْئًا إِلَّا خَالَفَنَا فِيهِ
ابن كثير

12*– قَالَ عُمَر بْن الْخَطَّاب يَا رَسُول اللَّه يَدْخُل عَلَيْك الْبَرّ وَالْفَاجِر فَلَوْ أَمَرْت أُمَّهَات الْمُؤْمِنِينَ بِالْحِجَابِ فَأَنْزَلَ اللَّه آيَة الْحِجَاب وَكَانَ وَقْت نُزُولهَا فِي صَبِيحَة عُرْس رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِزَيْنَب بِنْت جَحْش الَّتِي تَوَلَّى اللَّه تَعَالَى تَزْوِيجهَا بِنَفْسِهِ وَكَانَ ذَلِكَ فِي ذِي الْقَعْدَة مِنْ السَّنَة الْخَامِسَة فِي قَوْل قَتَادَة وَالْوَاقِدِيّ وَغَيْرهمَا وَزَعَمَ أَبُو عُبَيْدَة مَعْمَر بْن الْمُثَنَّى وَخَلِيفَة بْن خَيَّاط أَنَّ ذَلِكَ كَانَ فِي سَنَة ثَلَاث فَاَللَّه أَعْلَم

13*– وَكَانَتْ الْمَرْأَة مِنْ نِسَاء الْمُؤْمِنِينَ قَبْل نُزُول هَذِهِ الْآيَة تَتَبَرَّز لِلْحَاجَةِ فَيَتَعَرَّض لَهَا بَعْض الْفُجَّار يَظُنّ أَنَّهَا أَمَة ، فَتَصِيح بِهِ فَيَذْهَب ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَزَلَتْ الْآيَة بِسَبَبِ ذَلِكَ. قَالَ مَعْنَاهُ الْحَسَن وَغَيْره          القرطبي

* " قَالَ كَانَ نَاس مِنْ فُسَّاق أَهْل الْمَدِينَة يَخْرُجُونَ بِاللَّيْلِ حِين يَخْتَلِط الظَّلَام إِلَى طُرُق الْمَدِينَة فَيَعْرِضُونَ لِلنِّسَاءِ وَكَانَتْ مَسَاكِن أَهْل الْمَدِينَة ضَيِّقَة فَإِذَا كَانَ اللَّيْل خَرَجَ النِّسَاء إِلَى الطُّرُق يَقْضِينَ حَاجَتهنَّ فَكَانَ أُولَئِكَ الْفُسَّاق يَبْتَغُونَ ذَلِكَ مِنْهُنَّ فَإِذَا رَأَوْا الْمَرْأَة عَلَيْهَا جِلْبَاب قَالُوا هَذِهِ حُرَّة فَكَفُّوا عَنْهَا فَإِذَا رَأَوْا الْمَرْأَة لَيْسَ عَلَيْهَا جِلْبَاب قَالُوا هَذِهِ أَمَة فَوَثَبُوا عَلَيْهَا وَقَالَ مُجَاهِد يَتَجَلَّبْنَ فَيُعْلَم أَنَّهُنَّ حَرَائِر فَلَا يَتَعَرَّض لَهُنَّ فَاسِق بِأَذًى وَلَا رِيبَة وَقَوْله تَعَالَى " وَكَانَ اللَّه غَفُورًا رَحِيمًا " أَيْ لِمَا سَلَف فِي أَيَّام الْجَاهِلِيَّة حَيْثُ لَمْ يَكُنْ عِنْدهنَّ عِلْم بِذَلِكَ
الاحزاب 59 ابن كثير

* قَالَ : ثنا سَعِيد ، عَنْ قَتَادَة ، قَوْله : { يَا أَيّهَا النَّبِيّ قُلْ لِأَزْوَاجِك وَبَنَاتك وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ } أَخَذَ اللَّه عَلَيْهِنَّ إِذَا خَرَجْنَ أَنْ يُقَنِّعْنَ عَلَى الْحَوَاجِب { ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ } وَقَدْ كَانَتْ الْمَمْلُوكَة إِذَا مَرَّتْ تَنَاوَلُوهَا بِالْإِيذَاءِ ، فَنَهَى اللَّه الْحَرَائِرَ أَنْ يَتَشَبَّهْنَ بِالْإِمَاءِ .

* – وَكَانَ بِالْمَدِينَةِ رِجَال مِنْ الْمُنَافِقِينَ إِذَا مَرَّتْ بِهِمْ امْرَأَة سَيِّئَة الْهَيْئَة وَالزِّيّ ، حَسِبَ الْمُنَافِقُونَ أَنَّهَا مَزْنِيَّة وَأَنَّهَا مِنْ بُغْيَتهمْ ، فَكَانُوا يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنَات بِالرَّفَثِ ، وَلَا يَعْلَمُونَ الْحُرَّة مِنَ الْأَمَة ؛ فَأَنْزَلَ اللَّه فِي ذَلِكَ : { يَا أَيّهَا النَّبِيّ قُلْ لِأَزْوَاجِك وَبَنَاتك وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبهنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ }
**الطبري الاحزاب 59**

14– ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێ کە ڕێگرتن و ئازاردانی کۆیلە ڕێپێدراو بێ، نەخێر، بەلکو فاکتەرەکانی بونی کەنیزەک یان کۆیلەکان، لە ڕۆژگارەدا زۆر

بوون. کارێکی ئەوەندە ئاسان نەبوە کەچارەسەری تەواو بکرێن و کۆیلەکان خۆشیان هێشتا هۆشیار نەبوون. (( ئازادکردنی کۆیلە)) ڕێگەو یاسای تایبەتی خۆی هەبوە، –کە لە زۆر شوێندا باسی لێکراوە بەلام لێرەدا دەرفەتی باسکردنی نیە– و لە قۆناغەکانی دواتردا کەم کەم جێ بەجێ کرا.

15*– وَقَالَ أَبُو صَالِح : تَضَع الْجِلْبَاب وَتَقُوم بَيْن يَدَيْ الرَّجُل فِي الدِّرْع وَالْخِمَار وَقَالَ سَعِيد بْن جُبَيْر وَغَيْره فِي قِرَاءَة عَبْد اللَّه بْن مَسْعُود " أَنْ يَضَعْنَ مِنْ ثِيَابهنَّ " وَهُوَ الْجِلْبَاب مِنْ فَوْق الْخِمَار فَلَا بَأْس أَنْ يَضَعْنَ عِنْد غَرِيب أَوْ غَيْره بَعْد أَنْ يَكُون عَلَيْهَا خِمَار

النور 60 ابن كثير

**16***– وَسَبَب هَذِهِ الْآيَة أَنَّ النِّسَاء كُنَّ فِي ذَلِكَ الزَّمَان إِذَا غَطَّيْنَ رُءُوسهنَّ بِالْأَخْمِرَةِ وَهِيَ الْمَقَانِع سَدَلْنَهَا مِنْ وَرَاء الظَّهْر . قَالَ النَّقَّاش : كَمَا يَصْنَع النَّبَط ؛ فَيَبْقَى النَّحْر وَالْعُنُق وَالْأُذُنَان لَا سَتْر عَلَى ذَلِكَ ؛ فَأَمَرَ اللَّه تَعَالَى بِلَيِّ الْخِمَار عَلَى الْجُيُوب ، وَهَيْئَة ذَلِكَ أَنْ تَضْرِب الْمَرْأَة بِخِمَارِهَا عَلَى جَيْبهَا لِتَسْتُر صَدْرهَا

وَكَانَ سَبَب نُزُول هَذِهِ الْآيَة مَا ذَكَرَهُ مُقَاتِل بْن حَيَّان قَالَ : بَلَغَنَا وَاَللَّه أَعْلَم أَنَّ جَابِر بْن عَبْد اللَّه الْأَنْصَارِيّ حَدَّثَ أَنَّ أَسْمَاء بِنْت مَرْثَد كَانَ فِي مَحَلّ لَهَا فِي بَنِي حَارِثَة فَجَعَلَ النِّسَاء يَدْخُلْنَ عَلَيْهَا غَيْر مُتَّزِرَات فَيَبْدُو مَا فِي أَرْجُلهنَّ مِنْ الْخَلَاخِل وَتَبْدُو صُدُورهنَّ وَذَوَائِبهنَّ فَقَالَتْ أَسْمَاء : مَا أَقْبَح هَذَا فَأَنْزَلَ اللَّه تَعَالَى " وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارهنّ

ابن كثير

القرطبي **النور،32**

لَا يَحِلّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِن بِاللَّهِ وَالْيَوْم الْآخِر أَنْ تُخْرِج يَدهَا إِلَّا إِلَى هَا هُنَا . وَقَبَضَ نِصْف الذِّرَاع (القرطبي)

المصدر في مراجعة و جمع اسباب نزول الايات هو

www.quran.muslim-web.com

لێکدانەوەی ئایەتەکان: با ترجمەی کوردی مەلا محەمەد سالح ئیبراهیمی

17*– ڕۆژنامەی هاوولاتی ژمارە 213 سالي 2005

18*– (( **هذا و بالنسبة لموضوع الحجاب فبادئ ذي بدء لا يختلف نحن و الفضلاء من اهل العلم و المنصفون منهم– الذين لايرون ما نراه من وجوب تغطية جميع بدن المراة بما في ذلك وجهها و كفيها – لانختلف معهم او بمعنى الاصح لا يختلفون معنا في ان الافضل والاكمل والاقرب للتقوى و مرضاة الله و رسوله هو ستر كل بدن بما في ذلك الوجه و الكفين))**

الحجاب ادله الموجبين **مصطفى بن العدوي والمخالفين**
**الطبعة الاولى1991**

19*– قات جووین – قات شتێکە وەک تلیاک و جگەرە پیاوان هەمیشە لە دەمیاندا دەیجوون – نەریتێکی زیان بەخشە لە هەنێ وولاتی عەرەبیدا بەتایبەنی یەمەن پەیرەو دەکرێ – خەتەنەی کچان – لە وولاتەکانی وەک سۆمال و سودان و میسر و هەندێ وولاتی ئەفریقی تر هەیە ... لە عێراق تەنانەت لە کوردستانیشدا بە بەرێژەیەکی کەمتر پەیرەو دەکرێ .

رِوونکردنەوەیەک بە گشتی لەسەر بابەتەکە

20 * ئەوەی منی گەیاندە ئەم ئەنجامانە ئەوە بوو ماوەیەک لەمەو بەر دوو ووتارم لە نوسینی ئازاد قەزاز خوێندەوە بە ناوی (علمانیەت و قەیرانی پیرۆزگەرایی) و ( ئیسلام لە موحەمەدەوە تا بن لادن ). ئەم دوو ووتارە لە مالپەرِی www.rwanin.net بلاوکراوەتەوە.

نوسەر لە ووتاری یەکەمدا هەولدودەدات پرِۆسەی بە عیلمانی کردن لە ناو مێژوودا و بەشداری کردنی ئایینەکان و چۆنیەتی کار لێکردنیان لەم پرِۆسەیەدا رِوونکاتەوە. لە ووتاری دووەمدا وا لە خوێنەر دەکات کە دیاردەی بە مێژووکردن و بە کۆمەلایەتی کردن بابەتیانە بخوێنێتەوە و تێکست لەناو کۆنتێکستدا دیاری بکات. هەروەها تێکرِای مێژووی ئیسلام لە رِوانگەی (رِێکخراوناسی)ەوە بخوێنێتەوە.

بیرۆکە و ئەنجامی ئەو دوو ووتارە بۆم بوونە زادە و دەروازەی ئەم باسەی سەرەوە لەمەرِ جۆرێکی تر لە خوێندنەوەی تێکستەکانی قورئان سەبارەت بە مەسەلەکانی ئافرەت لە ئیمرِۆدا و لە ناو کۆنتێکست و هەلو مەرجی هاتنەدیان و خستنە رِووی لایەنی بە ئایدیۆلۆژی بوونی ئەو مەسەلانە. هەروەها بانگەوازێک بێ بۆ هێنانەدی ووتارێکی تازەی وا کە لەگەل گۆرِانکاریەکان وبەرەورِووبونەوەکانی ئەمرِۆی دنیادا هەلبکات و کاریگەری هەبێ